# سەد غەزەلی مەولانا

عەلی نانەوازادە



١٠٠

# غەزەل

# مەولانای ڕۆمیی

(١٢٧٣ – ١٢٠٧.ز)

ستۆکهۆڵم

٢٠٠٦

**" مەستان سەلامت لێدەکەن "**

**ئەو مەستانە کە هەزارن، یەکن.**

**عەلەیکەسسەلام ئەوەیە کە بێی نەک لە دوورەوە بڵێی و بنووسی**

**(لە نامەیەکی مەولانا)**

# پێشەکی

مەولەویی ناوێکە ئاشنا، کەچی ڕوانگە و بەرهەمەکانی بەس نەناسراون دە ئەدەبی کوردیی دا. سەرەڕای نزیکی دوو زمانی کوردیی و فارسیی، سەرەڕای شوێن پەنجەی زەقی ئەدەبیاتی کلاسیکی فارسیی دە ئەدەبی لاوازی کوردیی دا، چ هەوڵێکی بەرچاو بۆ وەرگێڕانی شوێنەوارە کلاسیکەکان لە زمانی فارسییەوە نەدراوە. زۆربەی ئەورووپایی-یەکان و کۆمەڵگاکانی دیکە بێجگە لە ئەدەبیاتی دەوڵەمەندی خۆیان، دەمێک ساڵە خۆیان بە ئەدەبیاتی گەلەکانی دیکەوە خەریک کردوە و خەزێنەی فەرهەنگیی-یان لەو دوڕ و گەوهەرانە ئاخنیوە. مەولەویی یەک لەو کەسانەیە کە تەواوی بەرهەمەکانی بە گەلێک زمان تەرجومە کراونەتەوە و سەرەڕای دووریی ئەو زمانانە لێکتر، گەلێک جار تووشی کابرایەکی سویدیی دەبم کە بە هەست و سۆزەوە وەرگێراوی چەند بەیتێیک لە غەزەلەکانی مەولەویی یا بەندێکی مەسنەوییم دە تاکسی دا بۆ دەخوێنێتەوە و لەززەت و سەرمەستیی خۆی دەردەبڕێ.

گەلی کورد خاوەنی یەک لە فەقیرترین و هەژارانەترین ئەدەبیاتە و ئەدەبێکی جیددی لە پاش بە جێ نەماوە، کە مەمانان دڵمانی پێخۆش بکەین. کوێرەکانییەکە کە بە زەحمەتە چەند دڵۆپێکی لێدەدەڵێ و بەشی لێو تەڕ کردنی دەمێکیش ناکا، چ بگا بە جام و گۆزە لێ پڕ کردن و بەهبەهـ و چەهچەهـ ... بەڵام چ خەم کە دەریایەکی شیرینمان لە پەنایە بەس نزیک؛ تەنیا هیممەتی دەوێ گۆزەکان بەرین و حەوز و ئەنباراوەکانی پێ پڕ بکەین. ژێر دەست بوونی گەلی کورد دە نێوان دەوڵەتانی فارس و

تورک و عەرەب دا ئەگەر برینێک و گریمانەیەکی خستۆتە سەر دڵ و گیانی ئەو خەڵک و سیاسیکارانە، خۆ باغ و گوڵستانێکە بۆ ئەدەبیات و هونەر و فەرهەنگ، بۆ کۆ کردنەوەی چەپکەگوڵەکان و پڕ کردنی زەمبیل و سەوەتەکان لەو بەروبوویانە. - لە لافی فیتنەیی تاتار کەم کە/ لە ناوکی ئاسکی تاتار بێژە -

ئەم زمانی کوردییە بە دەوڵەتێک و کەچە دەستەڵاتێک هەروا لە خۆوە دەوڵەمەند نابێ، شۆرەکاتێک بە دوو بارانی پەڵە و چەند پەقرەج و ئاوپاش نابێتە گوڵشەنی خەملاوە. ئەم زەوییە کود و خاکێکی بە قەوەتی دەوێ و ساڵیانێک کار، هەتا ئای بەشکەم ڕۆژ و ڕۆژگارێک چەند گوڵ لەو خاکە پووچەڵە سەر دەربکەن. زمانێک بێ ئەدەبیات و بێ شێعر و بێ هزر و بیر، مەگەر هەر بە کاری سەودا و گوێبرین و یەکتر خاپاندن و درۆی و دەلەسەی سیاسییکاران و بازاریی-یان بێ.

دەو وەرگێڕانە دا هەوڵم داوە بە پێی گونجان، وەزن و قافیە و لەحن و تەنانەت وشەکانیش کە بۆ زمانی کوردیی نامۆ نەبن، هەروەک ئەسڵی غەزەلەکە ڕەچاویان بکەم و پێشکەش بە کۆڕی ئاشقان و عارفانی بکەم.

سەرچاوەی وەرگێڕاوەکان: ١- کلیات شمس تیریزی، بدیع الزمان فروزانفر، چاپ مهارت، چاپ سوم، تهران ١٣٨٣. ٢- گزیده غزلیات شمس، محمدرضا شفیعی کدکنی، چاپ دهم، ١٣٧٥. ٣- جذبات الهیه، شێخ اسداالله ایزدگشسب، چاپ دوم، ١٣٧٨

زەمان بێژینگێکی کون دریشتە کە جگە لە گەوهەری گەورە نەبێ چی لە سەر نامێنێتەوە. کەسەکان و ناوەکان وەک پۆرگی باران لە سەر دەریای بێبن و بێپەی ژیان پەیدا دەبن و دەمێک و دوو دەمێننەوە و تەق بۆ عەدەم دەچنەوە. تەنیا کەسانێکی کەم لەو فەرتەنە و غەوغایەی قەرن و مێژوو دەردەچن و تروسکەی گەوهەرەکانیان لە بەر هەتاوی گەلێک زەمانان دەدرەوشێتەوە. چیە ڕازی مانەوەی مەولەویی دوای هەشتسەد ساڵ، کە هەر ئێستا بە هەزاران هەزار شاعیر لە گۆشە و کەناری دونیا دەژین و شێعرەکانیان بە باشترین ئیمکانات و جوانترین چاپ بە هەموو دونیا دا بڵاو دەبێتەوە، بەڵام چ ناو و دەنگیان نامێنێ و وەک پۆرگەکان دەتەقن و ون دەبن.

وڵامەکەی دە جەهانبینیی دا دەبینینەوە. هەر کاسەیەک لە قەدەر ئەندازە ئاو وەخۆ دەگرێ. جەهانبینییش ئەو پەیمانە و ئامانەیە، کە مەمانان بۆ پێوانەی ڕوانگە و دیدەکانمان بە کاری دەهێنین. کاسەی چووک ئاوی کەم، دەریایەک دە دەروون دا ڕوانگەیەکی بەرفرەوانتر و، عارفان نوقمن دەو دەریایە دا.

**ئێمە هی باڵاین و بۆ باڵا دەچین**
**ئێمە هی دەریاین و بۆ دەریا دەچین**
**ئێمە هی ئەولا و ئەم لایانە نین**
**ئێمە هی بێجاین و بۆ بێجا دەچین**
**قالبی وەک کێومان گەر نەگرێ ڕێ**
**ئێمە بۆ قاف و بەرەو عەنقا دەچین**

زمانی عیرفان شێعره و زۆربەی عارفان و ئاشقان شاعیر بوون. ئەگەر تەنانەت شێعریشیان نەکوتبێ بەیانیان شاعیرانە بووە و کەلامیان شان لە شانی باشترین شێعرەکانی ئێستاش دەدەن. شێعری عارفان لە چاو شاعیرانی دیکە، درەوشانەوەیان وەک جیاوازی شۆقی ئەستێرەیەکی دوورەدەست و هەتاوێکی بەردەستە. هەتاوێک کە بەفر و سەهۆڵی تەنیایی و هیوابڕاویی وجوود دەتوێنێتەوە و هەوای بەهاریی بە ژیانەکان دا بڵاو دەکاتەوە. هەتاوێک کە کوڵمی بەر و میوەکانی باغی ژیان ڕادەمووسێ و ئاسمانی ساوی هاوین بە دیاریی دەهێنێ.

**دڵێك کە لە ئاسمان و چەرخەکانی فەلەک گەورەترە و هەراوتر و لەتیفتر و ڕوونترە، بۆ دەبێ بە بیر و وەسوەسە تەنگی بکەی و عالەمی خۆش لە خۆت بکەیە زیندانی تاریک؟ چ ڕەوایە عالەمی هەروەک گوڵستان لە خۆت بکەیە زیندان - هەروەک کرمی پیلە، لیکاوی بیر و وەسوەسە و خەیاڵاتی مەزمووم لە دەوری خۆ تەنین و خۆ زیندانی کردن و خۆ خنکاندن؟**

**ئێمە ئەوەین کە زیندان لە خۆمان دەکەینە گوڵستان. کە زیندانمان گوڵستان بێ بڕوانە کە گوڵستانمان دەبێ چ بێ. (شەمس)**

**شادیی هەروەک ئاوی لەتیفی ڕوون بگاتە هەرکوێ دەسبەجێ شکۆفەی عەجەبێک دەپشکوێ.**

**خەم هەروەک سیلاوێکە ڕەش، بگاتە هەرکوێ، شکۆفە دەژاکێنێ و ناهێڵێ کە سەر هەڵبدا. (شەمس)**

**دڵی من خەزێنەی کەس نیە، خەزێنەی هەقە. قوماشی وشترەونانی بۆ لێهەڵبڕێژم؟ تووڕیان دەدەم. ئەم زەمیرەی خەڵک شتێکی دیکەیە، تاقەتی ڕاگرتنی نیە ئیللا خەزێنەی پادشا نەبێ.(شەمس)**

**" دە ئەندەروونی پێستی من دا دەریایەکە کە هەرکات بایەک هەڵیکاتێ لەم دەریا مژ و باران سەرهەڵدەدا، لە عەرش هەتا سەر ڕووی زەوی باران دەبارێ. " (خەرەقانی)**

**شیبلی کوتی: کاتێک دەروون و لەشم بە ئاگر سپارد نۆرەی دڵ گەیشت. داوای دڵی لە من کرد. کوتم دەیدەم و باکم نیە. نەدا هات، ئەی شیبلی لە دڵ بگەڕێ کە دڵ نە هی تۆیە و نە دە دەستەڵاتی تۆ دا! دڵ دە دەستەڵاتی ئێمە دایە! ئەی شیبلی ئەگەر ناچار دڵ دەبێ بسووتێ، حەیفە بەم ئاگرەی سوورەت بیسووتێنی، کەوایە بە ئاگری ئەشق بیسووتێنە! (کشف الاسرار)**

**ڕۆژێک شیخ [ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر] دەگەڵ تاقمێک سۆفی گەیشتنە بەر ئاشێک. ئەسپی ڕاگرت و ماوەیەک وەستا. دوایی کوتی " دەزانن ئەم ئاشە دەڵێ چی؟ دەڵێ: تەسەووف ئەمەیە کە منی تێدام. دریشت وەردەگری و نەرم دەیدەیەوە دەرێ و بە دەوری خۆت دا تەواف دەکەی. سەفەر دە خۆت دا دەکەی هەتا هەرچی پێویست نیە لە خۆتی دووور بکەیەوە. " (اسرارالتوحید)**

هەرکەس بەش بە حاڵی سروشتی خۆی و میراتێک کە لە باوک و دایک و باپیر و داپیرەکانی پێیگەیشتووە پارچە زەوییەکە. یەک ڕەقەن، یەک شۆرەکات، یەک شێوەرد، یەک خۆڵەپۆتینە، یەک زەردوماهـ...

پێنج کەس دە پێگەیاندن و پێگەیینی مەولەویی دا دەوری سەرەکیان هەبووە.

یەکەم: بەهائەددین وەلەدی باوک، عەلامەی سەردەم و یەک لە گەورەکانی سۆفییە کە نازناوی سوڵتانەلعولەمای پێدرابوو کە: زەوییەکی شیاوی کانیاوێکی مەزنی بە مەولەویی بەخشیوە.

دووهەم: بورهانەددینی موهەقیق مریدی خۆشەویستی بەهاوەلەد و لالای مەولەویی کە هەر لە سەردەمی منداڵەتی دۆستایەتی دەگەڵ مەولەویی دارشتووە و لە سەر شانی خۆی گێڕاویەتی و هەتا دوایین پلەکانی زانستی سەردەمی خۆی گەیاندووە کە: وەک ئاوێک ژێرزەوییەکەی لیپاولیپ و پڕ لە ئاو کردووە.

سێهەم: شەمسی تەورێز قەلەندەر و دەروێشێکی ڕووت کە دوای مەرگی بورهانەددین گەیشتۆتە سەری و: قوڵینگی بە قەوی لە توێژی

ڕەقەنی زەوییەکەی کوتاوە و کانیاوی ئەشقی مەولانای بە سەماع و غەزەل و مۆسیقا، جۆشان و خرۆشان وەڕێخستووە.

چوارەم: سەلاحەددینی زەرکوب مرید و خەلیفەی بورهانەددین کە پیاوێکی ئوممی بەڵام تەواو ڕووحانیی کە دوای غەیبەتی شەمس: وەک دەشتێک باوەشی بۆ تەوژمی سێڵاوی خرۆشانی کانیاوی مەولەویی کردۆتەوە، هەتا ئارام و هێدی ڕێگەی ببڕێ و کەف و کوڵی دامرکێنێ.

پێنجەم: حیسامەددینی چەلەبی کوڕە لاوێکی خەڵکی ورمێ کە: ڕووباری پڕباری مەولەویی گەیاندۆتە دەریای مەسنەویی هەتا گەوهەر و دوڕ و مرواری و سەدەفە ڕەنگین و نەقشینەکانی لە سەر بەستێنی سەدەکان هەڵبڕێژێ.

مەولەویی ناوی مەحەممەد و نازناوی جەلالەددینە کە نازناوی خوداوەندگار-یشی هەیە و ئیستاکەش بە مەولەویی و مەولانای ڕۆمیی دەناسرێ و دە غەزەلەکانیشی دا بە ئاماژە، خۆی بە خامۆش یا خەمۆش ناو دەبا.

مەولەویی لە ٣-ی دسامبری ساڵی ١٢٠٧-ی زایینی لە شاری بەلخ کە ئیمڕۆکە سەر بە ئەفغانستانە لە دایک بووە و لە یەکشەنبە ئێواری ١٧-ی دسامبری ١٢٧٣-ی زایینی دەگەڵ ئاوابوونی هەتاو لە شاری قۆنیە کە سەر بە تورکیایە ئاوا بوو و هەر لەوێش نێژراوە.

بەلخ پێشتر ناوەندییکی ئایینی بوودا بووە و دە سەردەمی مەولەوییش دا ناوەندێکی تەسەووف بووە و کۆمەڵیک عارفی بەناوبانگ هی ئەم شار و ناوچەیە بوون. بەهائەددین وەلەد لەبەر نێواناخۆشی دەگەڵ خارەزمشا و ترسی مەغوول لە ساڵی ١٢١٨-ی زایینی باروبنەی تێکەوەدەپێچێ و بە تەمای حەج و بەغدا دەگەڵ کۆمەڵیک مرید و مەولانای مێرمنداڵ لە بەلخ دەردەکەون. ڕۆیشتنێك کە گەڕانەوەیەکی بە دواوە دا نابێ. ئەو کاروانە دەگاتە نەیشابوور و گۆیا لەوێ بەهائەددین وەلەد و عەتتار-ی عارف یەکتر دەبینن و دیارە مەولەوییش دەگەڵ باوکی بووە. عەتتار کە زیرەکی ئەو کوڕە دەبینێ، پێشبینی دەکا کە " بەمزوانە ئاگر لە سووتاوانی عالەم بەردەدا " و کتێبی ئەسرارنامەی خۆی پێشکەش دەکا.

**" کاتێک لە بەغدا نزیک بوونەوە خەفیرەکانی شار بەرەو پیریان هاتن کە ئێوە چ قەومێکن و لە کوێوە دێن؟ حەزرەتی بەهاوەلەد سەری لە کەژاوە دەرکێشا جوابی داوە کە: من الله و الی الله و لا حول و لا قوه الا بالله، لە لامەکان دێین و بۆ لامەکان**

**دەچین. خەفیرانی عەرەب سەریان سوڕما. کەسێکیان نارده لای خەلیفه و حاڵیان گێراوه که جەماعەتێکی گەلێک زۆر گەیشتوون زۆربەیان عولەما و فازلانن و له خوراسانەوه هاتوون... خەڵیفه یەکێکی نارده خزمەت شێخی مەشایخی زەمان شەهابەددینی سۆهرەوەردیی... شێخ کاتێک ئەو حەکایەتەی له خەڵیفه بیست فەرمووی که: ما هذا الا بهاالدین الولد البلخی، که وەها قسەیەک و وەها وتارێک لەم سەردەمە هیچکەس نەیکوتووه مەگەر بەهاوەلەد. " (ئەفلاکی ل ١٧)**

له ساڵی ١٢٢٠-ی زایینی ئەو کاروانه دەگاته ئاناتۆلی... دایکی مەولانا دەمرێ... دوای ماوەیەک سەفەر بۆ ئەولا و ئەملا مەولەوییش دەگەڵ کچێک به ناوی گەوهەرخاتوون زەماوەند دەکا... له ساڵی ١٢٢٦-ی زایینی یەکەم منداڵی که کوڕێک دەبێ به ناوی سوڵتان وەلەد دێته سەر دونیا... ساڵی ١٢٢٨-ی زایینی ئەو کاروانه نیشتەجێی قۆنیه دەبن و دوای چەند ساڵان باوکیش دەمرێ... مەولەویی له تەمەنی بیست و چوار ساڵی وەک عالیم و زانایەکی توانا له سەر جێگەی باوک پاڵ دەداتەوه و ڕێبەرایەتی و شێخایەتی ئەو کۆمەڵەیه وه ئەستۆ دەگرێ.

باوکی مەولەویی کتێبێکی هەیه به ناوی مەعارف، که کۆکراوەی مەوعیزه و قسەکانیەتی و خودی مەولەویی ئەو کتێبەی دایم خوێندۆتەوه و تەنانەت بورهانەدینی مەهەقیقیش ناچاری کردووه که هەزار جاری بخوێنێتەوه. ئەو کتێبه به گشتی له سەر ئەڵڵا و ئەشق به ئەڵڵایەکی زیندوویه و شوێن پەنجەی بەشێک له تەسویرەکان و بیرەکان و ئەشقی باوک ده غەزەلەکان و مەسنەویی مەولانا دا دەبیندرێ.

**" چوومه مزگەوت. سەرم دێشا. کوتم باسی ئەڵڵا دەبێ وەها بکەم که ئەڵڵا فەراغەتێکم بداتێ له دەردی سەر و له هەموو دەردەکان و له هەموو ئەندێشەکان. کوتم که یادی ئەڵڵا دەکەم، هەر وەجهێک که لەتافەت و خۆشییەکم تێبخا بەو وەجهە یادی دەکەم و وەجهێک که ئەو لەتافەتم تێنەخا نەفی دەکەمەوه و نه باسی دەکەم و نه**

**بیری لێدەکەمەوە، یانی لە حۆریی و قەسرەکان و لەرزین لە خۆفی دۆزەخی وی، لە کاتی یادی ئەڵڵا هیچ بیر لەوانە ناکەمەوە. دیتم کە ئەڵڵا منی داگرت و دە باوەشی گرتووم... ئەی ئەڵڵا و ئەی خودا ئەم گۆشت و قالبەی من ئاستانەی دەرگای تۆیە و من لەوێ خەوتووم و دانیشتووم و لە لای تۆم و لە لای تۆ بۆ جێگەیەکی دیکە ناچم. ئەو قالبەی من ئەی ئەڵڵا کارگای تۆیە و هەستەکانی من نەقشکراوی تۆن و لە پێش تۆیان دادەنێم هەتا هەرچی کە پێتخۆشە نەقشیان بکەی. ئەی ئەڵڵا من هاتوومە لای تۆ چون خودای من تۆی. جگە لە تۆ کێم هەیە. " (ل ١٣)**

**" ... من دەو نێوە دا دەمدیت لە سەر کۆڵی ئەڵڵام. دیسان دەمدیت کە هەم من و هەم چەرخ و هەم ئەفلاک و خاک و عەرش هەموو لە سەر کۆڵی ئەڵڵاین هەتا لە کوێ فڕیمان بدا تا هەموو هاواری ئاشقانە بەرز بکەینەوە، کە ئەی ئەڵڵا ئێمە چنگمان لە تۆ داگرتووە و بە کۆڵی تۆوە نووساوین و لە کۆڵت نابینەوە، چونکە ئاشقی زار و نزاری تۆین. هەنووکە ئەی ئەڵڵا، کاتێک یەکدەم چاو و نەزەر لە تۆ دەبڕم و مەزنایەتی و حوسنی تۆ دەبینم دەحەسێمەوە و هەناسەیەکی خۆش هەڵدەکێشم و دەمێکی دیکە ناڵەی ئاشقانە لێدەدەم و وەختی خەویش هەرواین. هەنووکە کە دیتم ئێمە هەموومان لە سەر کۆڵی ئەڵڵاین و ئەڵڵا دەمانبزوێنێ و شەربەت و خۆشیی جۆراوجۆرمان پیدەگەیەنێ و ئێمە لەو خۆشیانە مەست دەبین و هاوار دەکەین. ئەڵڵا هەستەکانمان ڕێکوپێک دەکا و دە ئەندەروونمان دا گەڕی دیکە و عەجایبی دیکە دەنێرێ و دەنوێنێ. هەتا من ئەوانە هەموو دەبینم و نوقم دەبم لە ڕیزی ئەوکەسانەی کە ئەڵڵا ڕووحی هەرکەسێك لە عالەمێک دا دەگێڕێ و مەلەکووتی خۆی پێ نیشان دەدا، هەتا بزانی کە مەلەکووتی ئەڵڵا بێنەهایەتە. " (ل ١٢)**

**" بەیانی لە مزگەوت دانیشتبووم. هەرکەس سڵاوی دەکرد و سجوودی دەکرد. کوتم کە ئەڵڵا ڕووحی من بە وان دەنوێنێ و ڕووحی من دەڕازێنێتەوە و ڕازاوە بە وانی دەنوێنێ. ئەوان شوێنەواری ئەڵڵا دەبینن و سوجدەی من دەکەن لەبەر دۆستایەتی ئەڵڵا، ئەگەر ڕیا و نفاق و دووڕوویی بێ ئەوانیش هەر ئارایشی ئەڵڵان و کاتێک خەڵک ساجدی ڕووحی خۆم دەبینم شوکری ئەڵڵا زیادە دەکەم و دەبینم کە ئەڵڵا ڕووحی من دەگەڵ ڕووحی خەلکی دیکە جار لێک گرێ دەدا و جار دەیکاتەوە... دەمدیت ئەوانە هەموو حوکمی (حی قیوم)ن و من (حی قیوم)م دێنا پێش دڵم و سەیری ژیانی ئەڵڵا و کارسازیی ئەوم دەکرد. دڵم دەبووژاوە. دیسان سەیری سفەتی هەستەکانی خۆم کرد دیتم کە ئەڵڵا تایفەیەکی لە سزای سەرما و زەمهەریر ڕاگرتووە و تایفەیەکی لە گەرما و نار. دیسان سەیری جەهانم کرد عالەمم ڕێکوپێک دیت... دیسان سەیرم کرد دەریای بێپایان و سادەم دیت و عەدەمی لێکدراو و دەرگاکانی هەڵگیراو... دیسان سەیرم کرد جەهانم (وحده لا شریک له) بینی، دیسان سەیرم کرد لە سفاتی بێنەهایەتیی و بێغایەتیی. دیتم کە هیچ دەریا وەک وی ناچێ و چووک دەنوێنێ. دیسان سەیرم کرد تایفەیەکم دە خۆشیێ و دە سەماع و شادیی دا دیت. کوتم**

ئەوانە بەهەشتیین و تایفەیەکم دەرددار و ناڵان دیت و کوتم کە ئەوانە دۆزەخیین. دیسان سەیرم کرد ئێرەیی و کینە و دوژمنایەتییم دەدیت دە هەندێکان دا، کوتم بڵا پاشەوەی ئەوان سەیر بکەم هەتا بزانم کێیە کە ئەوانەی بڵاو کردۆتەوە و بە منی دەنوێنێ. ئەڵڵام دیت کە ئەوانەی بە دەستەوە گرتووە و بەرەو منی دێنێ هەتا بیانبینم و ئەو نەقشانە لە پێش من دەنەخشێنێ... هەرئەودەم دیتم کە درەختی ئێرەیی و دوژمنی و کین هەموو لە بەر چاوی من، بوون بە یاسەمەنی سپی و شکۆفە و گوڵ و لە بەر پێم هەڵوەرین. دیسان ئەگەر غەم و خەفەتم هەبێ دەبینم کە ئەو غەم و خەفەتە زولفی ڕەشی ئەڵڵایە کە بە سەر منی داداوە و دیسان ئەو دەبینم کە ئەو لە سەر من لا دەدا... ئەوانە کە دەبینم ئەڵڵا ڕێنوێنی کردووە بە ڕێز گرتن لە من کە نعمت الله -م و نعمت الله دەبێ ڕێزی لێبگرترێ. " (ل ١٤)

" پرسیاری کرد کە: چلۆنە دۆستان ئەوەندەیان بەڵا پێدەگا؟ کوتم: بەڵا بە مانای چاکەیە هەرچەند بە ڕواڵەت ڕەنج دەخاتە سەر لەش، بەڵام دڵ دە بنی ئەو ڕەنجە دا خەندانە، هەروەک هەوری بەهاریی کە دەگری و گوڵ پێدەکەنێ. لەش لە ڕووی ڕواڵەت هی دونیایە و دونیا سەرای بەڵایە و ناچار بەڵا بە لەش دەگا، بەڵام دڵ چونکە هی دونیای دیکەیە دە باغی خوررەم دایە. دیسان لەش چونکە بە مردوو حیسابە شادیی شایەن نیە و دڵ چونکە جێگەی وەرگرتنە، شادیی بە نەسیب ئەو دەبێ. ئەو پێچەوانەییە لە ئەهلی دونیاوەیە کە شادیی دەدەن بە لەش و غەم دە دڵ دەنێن. ئەو دەلقپۆشە موخلیسە دەبینی کە دڵی وەک گوڵستانی خەندانە. " (ل ٦٢)

## بورهانەددینی موهەقیقی تیرمیزیی

لە ساداتی تیرمیز (تێرمەد) بوو کە ببوو بە مریدی بەهاوەلەد. وەختایەک باوکی مەولانا لە بەلخ دەردەکەوێ و دەڕوا، بورهانەددین لە بەلخ نابێ. ئەویش نابەچار سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەچێتەوە زێدی خۆی تیرمیز و خەریکی ژیانی خۆی دەبێ و گوێبیسی هەواڵی پیری خۆی؛ هەتا خەبەردار دەبێ کە نیشتەجێی ڕۆم بوون. بورهانەددین گۆیا خەبەری لە داهاتووە داوە و توانایی پێشبینی هەبووە و هەر لەبەر ئەوە نازناوی سەییدی سیڕزانیان پێداوە.

ئەفلاکی دەنووسێ:

**"... حەزرەتی سەیید لە مڵکی خوراسان و تیرمیز و بوخارا و غەیرە ناسراو، سەییدی سیڕزانیان پێدەکوت... ڕۆژێک خەریکی مەعرەفەت کوتن بوو، هاوارێکی گەورەی لێدا و زۆر گریا کە مخابن حەزرەتی شێخم لە عالەمی خاک بەرەو عالەمی پاک کۆچیان کرد. - جەماعەتێک کە حازر بوون تاریخی ڕۆژ و ساڵیان سەبت کرد دوای ئەوە کە گەیشتە مڵکی ڕۆم وەها بوو کە فەرمووبووی - فەرمووی کوڕی شێخەکەم جەلالەددین مەحەممەد تەنیایە و نیگەرانی منە. لە سەر من فەرزی عەینە کە بەرەو دیاری ڕۆم بڕۆم و ڕووم لە خاکی پێی هەڵسووم و دە خزمەتی دابم و ئەو ئەمانەتەی کە شێخم بە منی سپاردووە، تەسلیمی وی بکەم... دەگەڵ چەند یاری هاودەم وە ڕێ کەوتن و کەند و لەندیان بڕی هەتا گەیشتنە دارەلمولکی قۆنیە. لە تاریخی [مەرگی] شێخ ساڵێک تێپەڕیبوو... یەکتریان دە باوەش گرت... دوای ئەوە حەزرەتی سەیید لە هەر زانستێک پرسیاری فەرموو و گەلێک جوابی بیست. سەیید هەستا و ژێر پێی خوداوەندگاری ماچ کرد و گەلێک ئافەرینی نارد و کوتی کە لە جەمیعی علوومی دینیی و یەقینیی لە باوک سەد دەرەجە تێپەڕیوە؛ بەڵام باوکت هەم عیلمی قاڵی بە کەمال هەبوو و هەم عیلمی حاڵ بە تەواو؛ لەمەبەدوا دەمەوێ کە دە عیلمی حاڵ دا سلووک بکەی... ئەو مانایە لە حەزرەتی شێخم بە من گەیشتووە و ئەویش لە من پێتدەگا، هەتا دە هەموو حاڵێک دا لە ڕواڵەت و دە باتین دا میراتبەری باوکت بی و وەک ئەوت لێبێ. هەرچی ئیشارەتی فەرموو ئیتاعەتی کرد... و نۆ ساڵی تەواو لە خزمەتی سەیید دا بەندایەتی کرد.**

**هەندێک دەڵێن هەرئەودەم بوو بە مریدی سەیید و هەندێک دەڵێن کە لە بەلخ لە سەردەمی باوکی خۆی بەهاوەلەد کرد بە مریدی و سەیید وەک لالا و ئەتابەک دەمبەدەم حەزرەتی خوداوەندگاری لە سەر شان دادەنا و دەیگێڕا (ل ٥٦)**

لە سەیید کتێبێک ماوەتەوە بە ناوی ***مەعارف*** کە کۆمەڵیک مەوعیزە و قسەیە.

**" نوورێکە دە نێو زاتی بەشەریان ناوە. ئەو نووره دەرناکەوێ ئیللا بە موجاهیدە. هەرچەند پێست ئەستوورتر بێ، مێشک زەعیفتر و شاراوەتر دەبێ. ئەگەر ئەو پێستە تەنکتر و زەعیفتر بێ بە موجاهیدە نوور قەوەت دەگرێ - هەروەک توێکڵی گوێز زەعیفتر، مێشکی ئەو ئاخنراوتر و هەروەتر بادام و پستە، هەرچەند توێکڵی ئەستوورتر، مێشکی زەعیفتر - یا هەروەک کانگای لەعل هەرچەند ئەو بەردی زێدە کەم بن شۆقی هەتاو، سفەتی بەرد بە لەعل پتر و زووتر دەکا و هەرچەند ئەو بەردە زێدەیانە لە سەرەوەی کانگای لەعل پتر بن شۆقی هەتاو شوێنی لە کانی لەعل کەمتر دەبێ و کەم عەمەل دەکا. هەنووکە خەڵک لە سەر لەعلی مەعرەفەت کە دە کێوی ئادەمی نراوە بەردی ئەنبار پتر دەکەن و شۆقی هەتاو ناچار هەر ڕۆژ کەمتر پێیاندەگا." ل ١٤**

**" عیلم، عیلمی مەعرەفەتە. ئەگەر هیچ نەزانی و خۆت بناسی، دەزانی عالیم و عارفی و ئەگەر خۆت نەناسی ئەو هەموو عیلمانە کە تۆ دەیزانی بە چ کەلکت دێ. " ل ١٨**

**" ئاخر هەیە و ئاخوڕ. هەر گایەک کە ئاخوڕیی بێ بزانە لەبەر کێردی قەسسابە و هەر گایەک کە ئەرابە بکێشێ دە ئەمان دایە. ئەگەر ئەو گایە لێی مەعلووم با کە لە ئاخوڕ چی پێدەگا، ئەرابە کێشانی پێ سەخت نەدەبوو و کەڵەوەی لێیدەبوو بە ڕاحەتیی گیان. ئێستا، هەر گیایەک کە دە ئاخوڕی گای بکەن ئەوە بۆ چەورایی مەنجەڵە نەک ئێحسان دە هەق گا دا... کەوایە هەرکات دە ئاخوڕ دا گیای زۆر ببینی مەڵێ کە: ئەوە ئێحسانە دە هەق من دا! کە بۆ بڕینی سەرە..." ل ٤٩**

**" خۆزگە بەو کەسەی چاوی خەوت و دڵی نەخەوت. هاوار بەو کەسەی کە چاوی نەخەوێ و دڵی بخەوێ. " ل ٦٤**

**" بمرە بەر لە مەرگ و نەفسی خۆت دە گۆڕی بێمرادیی دا بنێژە و خۆش بە. " ل ٦٩**

**یەکێک لە مریدەکانی مەولانای گەورە ڕۆژێک لە شێخی پرسی کە: هەرکەس شەرابی بخواتەوە چی لێدێ؟ کوتی: دەبێتە سەگ، دەبێتە بەراز، دەبێتە مەیموون. لای سەیید بورهانەددین ئەو حەکایەتەی گێراوە. فەرمووی کە: شێخم فتوای داوە کە هەرکەس وەهای لێبێ لێی حەرامە، ئەگەر وەهات لێدێ مەخۆوە و ئەگەر وەهات لێنەهات تۆ ئەو کەسە نی. " (ئەفلاکی ٤٨)**

**" خاتوونێکی گەورەماڵ مریدی سەید ببوو. ڕۆژێک وەک جەفەنگ پرسی کە: بە لاوەتیش موجاهیدە و ریازاتت بە کەمال گەیاندبوو، چ هۆیەکی هەیە کە ئاخر عومر ڕۆژووی ناگری و زۆربەی نوێژەکانیش ناکەی؟ فەرمووی کە: ڕۆڵە گیان! ئێمە هەروەک وشتری بارکێشین. باری گرانمان کێشاوە و زەختی ڕۆژگارمان چێژتووە و ڕێگای دوور و درێژمان کوتاوە، مەنزڵ و قۆناغی زۆرمان بڕیوە، پەشم و مووی ژیانمان وەراندووە، کز و لاواز و نامراد ماوین و لە ژێر باری گران ڕێبڕ و کەمخۆر**

**و گەرووتەنگ بووین. هەنووکە چەند ڕۆژێک لە جۆیان دابەستووینەوە هەتا هەندێک پەروار بینەوە و لە جەژنگای ویسالی سوڵتان، قوربانی بکردرێین چونکە قوربانیی لاواز لە متبەقی سوڵتان بە کار ناهێنن...خاتوون دەستی کرد بە گریان. " (ئەفلاکی ٦٤)**

بە پێی ڕەوایەتی سپەهسالار (ل ١٠٣) سەیید پێشبینی هاتنی شەمسی تەورێز دەکا و هەر بۆیەش داوا دەکا کە بچێتە قەیسەریە، بەڵام مەولەویی ئیجازە نادا. جارێک بێ ئیزن دەردەکەوێ و لە ڕێ ئەسپەکەی دەسڵەمێتەوە و سەید دەکەوێ و پێی دەشکێ و ناچار دەگەڕێتەوە. سەیید لە مەولانا دەپرسێ: ئەی نووری دیدە بۆ ئیزن نادەی کە بڕۆم؟ مەولەویی دەڵێ: تۆ بۆ لە ئێمە دووریی دەکەی؟ دەڵێ: شێرێک بەرەو ئێرە بەڕێوەیە. ئەو شێر و من شێر. ناتوانین دەگەڵ یەک بسازێین. مەولانا ئیزنی پێدا.

مەرگی سەیید دەبێ لە نزیک ١٢٤٠-ی زایینی ڕووی دابێ. مەولەویی کاتێک خەبەرەکەی دەبیسێ دەچیتە قیسەریە و هەر لەوێ دەینێژن و کتێبەکانی دەباتە کن خۆی.

مەولەویی دوای مەرگی سەیید لە سەر کورسی ئیرشاد دانیشت و دەستی کرد بە دەرس دانەوە و بانگەوازیی خەڵک بەرەو خودا. جلی عولەمایانەی دەبەر دەکرد و گەلێک شاگرد و مریدی هەبوو. پێنج ساڵ بەمجۆرەی گوزەراند هەتا ئەو شێرەی کە پێشبینیان کردبوو گەیشتە قۆنیە (ڕۆژی شەنبە ٢٣-ی ئۆکتبری ١٢٤٤ ز.) لە کاروانسەرایەک چاوەیەکی بە کرێ گرت و وە بازار کەوت هەتا نێچیرەکەی دە داو بخا.

## شەمسی تەورێزیی

لە شەمس کتێبێکی قەببە ماوەتەوە بە ناوی ***مەقالات*** کە یادداشتی قسەکانیەتی و وێدەچێ هەندێک مرید و کوڕی مەولەویی و حیسامەددینی چەلەبی ئەو قسانەیان نووسیبێتەوە. ئەم کتێبە سەرەڕای گەلێک کەموکوڕیی و ناتەواویی، لە هەموو بارێکەوە نرخی زۆرە و ناسیاوییەکی باش سەبارەت بە خودی شەمس و بیر و ڕوانگەی تیژ و ناسکی شەمس و دۆستایەتی و هاودەمی دەگەڵ مەولەویی دەداتە دەست. بە پێی ئەم کتێبە، شەمس لە بەر هەق دەپاڕێتەوە هەتا یەک لە ئەولیای خۆی پێبناسێنێ، هەتا دۆستایەتی دەگەڵ بکا. دە خەو دا پێیدەڵێن کە وەلییەکت پێدەناسێنین. دەپرسێ: لە کوێیە ئەو وەلییە؟ دەڵێن: لە ڕۆم. شەمس بۆ دیتنەوەی ئەو دۆستە وە ڕێ دەکەوێ، وەختایەک دەیبینێتەوە پێیدەڵێن: هێشتا وەخت نیە. " الامور مرهونە باوقاتها "

شەمس و مەولەویی دەبێ یەکتریان لە شام دیتبێ و بناغەی ناسیاویی دامەزراندبێ، بەڵام خودی دۆستایەتییەکە هێشتا وەختی دانەهاتووە. لە ئاکام دوای شازدە ساڵ، شەمس - کە تەمەنێکی شێست ساڵەی هەبووە و مەولەویی چل ساڵە - ڕوو دە قۆنیە دەکا و لەوێ کۆشکی ئەشق و دۆستایەتی دادەمەزرێنن. دە مەقالاتی شەمس دا هاتووە کە **" مەبەست لە وجوودی عالەم ملاقاتی دوو دۆستە کە ڕوو لێک بنێن بۆ خاتری خودا- دوور لە هەوا. مەبەست نان نیە، نانەوا نیە، قەسساب و قەسسابیی نیە. وەها کە ئێستا لە خزمەت مەولانا دا دەحەسێینەوە. "** ئەو وێککەوتن و یەک گرتنە ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی دە ژیان و ڕوانگەی مەولەویی دا پێکدێنێ. عالیمێکی دینی دە

ماوەیەکی کورت دا دەبێتە عارفێکی ئاشقی سەماعکەر، کە هەتا ئێستاش وەک ئەستێرەیەک لە ئاسمانی عیرفان دەدرەوشێتەوە. ئاوێکی ئارام و مەند کە دە ژێرزەمینەکان دا پەنگی خواردبۆوە نها تەقیوەتەوە و بە تەوژم و هاش و هوش وە ڕێ کەوتووە. چەند ڕەوایەت لە سەر ئەو دیدارە هەیە کە پتر وە ئەفسانە دەچن هەتا ڕاستی. بەڵام هەموو ئەگەر ئەفسانەش بن لە سەر گرینگایەتی ئەو وێککەوتنە و ئەو ئاڵوگۆڕییە هاوڕا بوون.

شەمس کابرایەکی زمانتیژی ڕووڕاستی ئەهلی سەماع و حاڵ بووە و کۆمەڵێک عارف و زانای سەردەمی خۆی ناسیوە و قسەی دەگەڵ کردوون و هیچیانی بە دڵ نەبووە و لاتاوی بە زۆربەیان داداوە. کەسانێکی وەک شێخی ئەکبەر ئیبنی عەرەبی و ئەوحەددەینی کرمانی و سۆهرەوەردیی و تەنانەت بایەزیدی بەستامیی و مەنسووری حەلاج-یشی بە ناتەواو و مەحجووب داناوە، کە بە پیاڵەیەک مەست بوون و ئەنەلهەق و سوبحانیان کوتووە.

**" من دەو عالەمە دا هیچ کارێکم بە عەوام نەداوە، بۆ ئەوان نەهاتووم، ئەو کەسانەی کە ڕێ پێشاندەری عالەمن، قامک لە سەر ڕەگی وان دادەنێم. (ب ١ ل ٨٢)**

**" ئەوان گەورەن، شێخن. من ئەوانم بۆ چیە؟ من تۆم دەوێ: نیازمەندێکم دەوێ، برسییەکم دەوێ، تینوویەکم دەوێ. ئاوی ڕوون لە تینوو دەگەڕێ لە بەر لوتف و کەرەمی خۆی. " (ل ١١٣)**

مەولەویی و شەمس ماوەی سێ مانگ لە حوجرەیەک کە سەلاحەددینی زەرکوب لە باغەکەی خۆی بۆی پێکهێنابوون خەلوەتیان کرد و دەو ماوەیە دا تەنیا سەلاحەددین و حیسامەددینی چەلەبی کە ئەودەم کوڕێکی لاو بووە ئیزنی سەردانیان هەبووە.

**دەگەڵ شەمسولهەقی تەورێز هەمە دیداری شایانە**
**لە تاو سەودای ئەشقی ئەو نە دیتم دڵ نە جانانە**

**لە لوتفی خۆی شەهەنشا بەخشی پێم گیانێکی نوێ و تازە**
**کە گیانی عارزیی لای ئەو خەیاڵە و نەقڵ و ئەفسانە**

**گرفتیک گەر دە مزگەوت دا لە تۆ شاراوەیە و پەنهان**
**بە گوێچکەی خۆت عەیان بیبیسە تۆ لەو پیری مەیخانە**

**لە ئەشقی شەمسی تەورێزی وەکوو مەجنوونە گیان و دڵ**
**ئەمن هەر هیچ، لە ئەشقی، ئەقڵی کوللیش بۆتە دێوانە**

مەولەویی لە مەسەلەکان و بابەتەکانی عیرفان و تەسەووف کابرایەکی خاو و نەزان نەبووە. ئەو کوڕی عارفێکی بە ناوبانگ بوو و مریدی عارفێکی وەک سەیید بورهانەددینی موهەقیق و لای کۆمەڵیک زانا و عارفی دیکە هەتا دوایین پلەکانی خوێندبوو. وەختایەک شەمس دەبینێ شێخ و عالیمێکی گەورەی سەردەمی خۆی بوو، کەوایە کەسێکی وەک شەمس ناتوانی بە سەواد و زانست فریوی بدا و شەمس-یش جادووگەر نەبووە کە بیەوی مەولەویی ئەفسوون بکا.

**" ئەو عیلمە بە مەدرەسە دەست ناکەوێ و بە تەحسیلی شەش هەزار ساڵە ـ کە ئەگەر شەش جار عومری نووحت هەبێ ـ پێکنایە. ئەو سەدهەزار تەحسیلە نابنە دەمێک دەگەڵ خودا بوونی بەندەیەک دە ڕۆژێک دا. " (ل ١١٤)**

**ئەشق ئیشی فەزل و عیلم و دەفتەر و ئەوراق نیە**
**هەرچی بێژن خەڵک و بنوێنن، ڕێگەی عوششاق نیە**

**پۆ و لکی ئەشق هی ئەزەل دانێ و بنی ئەشق هی ئەبەد**
**ئەم درەختە پاڵگەکەی هی عەرش و قورش و ساق نیە**

هەر کوتە دار و ئێزینگێک ئیستعدادی ئاگر گرتنی هەیە و گڕی چووکی شەمچەیەک بەسە هەتا ئاگر دە گیانیان بەرد بدا و بڵێسەیان بەرز بکاتەوە. بەڵام ئەگەر شەمچەیەک نەبێ ئەو کوتە دارانە دەڕزێن و دەپوێن و دەبن بە خاک و تامی گڕ و سووتان ناچێژن. شەمس ئەو شەمچەیە بوو کە ئامادەیی ئێزینگی وجوودی مەولانای بۆ گڕ گرتن ناسی، هات و بە شەمچەی ئەشق ئاگری تێبەردا.

**" وەختایەک خزمەتی مەولانا شەمسەددین بە من گەیشت و دواندمی، وەها ئاگری ئەشق لە دەروونمەوە بڵێسەی دەدا؛ بە توندی فەرمووی کە ئیدی قسەکانی باوکت مەخوێنەوە؛ بە ئیشارەی وی ماوەیەک نەمخوێندەوە. دوایە فەرمووی کە دەگەڵ کەس قسە مەکە. ماوەیەک بێدەنگ بووم و قسە و وەعزیشم نەدەکرد" (ئەفلاکی ل ٦٢٣)**

شەمس تەنانەت مەنعی خوێندنەوەی کتێبیش لە مەولەویی ئاشقی خوێندنەوە دەکا و هەموو ئەوانەش بۆ وە ئاگا هێنان و بێدار کردنی مەولانایە. کوتە زێڕێک کە دەبێ دە بۆتەی بێدەنگیی و خامۆشیی دەروونی خۆی دا قاڵ بێتەوە هەتا خەوش و ناخالیسیی لە گیانی دەرچێ و ببێتە ئەو زێڕە بێخەوشەی کە سەردەمێکی دوور و درێژ بترووسکێتەوە.

سوڵتان وەلەد کوڕی مەولەویی کە لە دوایی مەسنەویی-یەک لە سەر ژیانی باوکی دەنووسێ، پەیوەندیی شەمس و مەولەویی بە دیداری مووسا و خزر دەشوبهێنێ. مەولەوییش شەمس وەک خزر دەبینێ و شەمسیش چیرۆکی موسا و خزری زۆر پێ گرینگە.

مووسا سەرەڕای ئەوە کە پێغەمبەری خودا بووە، بەڵام کەسێکی بێدار و بە ئاگا نەبووە. لە خودا داوا دەکا کە یەک لە نزیکانی ئەو ببینێ و خوداش ئاکام ئادرێسی خزری پێدەدا کە بچێ بیبینێ. شەمس دە مەقالاتی خۆی دا ئەو داستانە وەها دەگێڕێتەوە:

**مووسا کوتی کە " کێ لە من عالیمترە دەو جەهانە دا؟ "**

**یووشەع کوتی کە " کەسێک هەیە دە عالەم دا لە تۆ عالیمتر. " تووڕە نەبوو و بە دڵی نەگرت کە " ئەوە دەڵێی چی؟ " ئیللا کوتی " ها ها! چ قسەیەک؟ " چونکە خوازیار بوو.**

**یووشەعیش نەبی بوو، ئیللا حوکمی نەدەکرد. ئەو سەردەمە حوکم مووسا دەیکرد. ئەو قسەیە لە لایەن خۆشمەوە دەیکەم: منیش ئەگەر مەتلووبێک ببینمەوە، هەر وا دەکەم، هەتا بتوانم ڕایگرم، هەتا حیجابێک دەرنەکەوێ.**

**ئەم چیرۆکە گەرمەی مووسا ـ کە لە بەر تینی ئەو ئاسمان دەسووتا ـ سارد سارد دەیگێڕنەوە.**

**کاتێک هاتە مەجمەعولبەحرەین، بە قەولی ئەهلی زاهیر نزیک ئانتاکیە بە لای حەلەب دا، یا لە سەر کێوێک، نوێژی دەکرد.**

**لە دوورەوە ئەوی دیت.**

**جا ئێستا، یووشەع کوتی " من ناسکیی کاری خزر دەزانم، بەرگەی قسە کردن ناگرم ـ کە بەرگەش بگرم، تۆ وەهات پێخۆشە لێی جوێ بیەوە کە ئیدی نەیبینیەوە. " ئەو گەڕاوە.**

**ئێستا مانەوە ئەوان. پێکەوە قسە دەکەن. گەلێک شت دەپرسێ و دەڵێ کە " چ دەفەرمووی؟ " نیاز ببینە لەو کەلیموڵڵایە بە هەق گەیشتوویە!**

**" وە ئاگات بێنم؟ " بە وەئاگاهێنەری خەڵک دەڵێ. نەبی یانی وەئاگاهێنەر. کەوایە ئاگادار بوو لە هەق. وەئاگای دێنێ بە هەقیقەتی هەق.**

**کە جاری دووهەم پرسیاری کرد، بە غەزەبەوە وڵامی داوە. ئەو غەزەبە نەفسانیی نیە. بەندەکانی خودا کەی غەزەبی نەفسانییان دەبێ؟ نەعوزوبیللا! ئەوە غەزەبی خودایە، دەبێ خۆی لێبپارێزی.**

**خزر چەپڵەی لێدا و لە خۆشیان سەمایەکی کرد کە " ئاخر، زوو بیڵێ، ڕزگارم کە، خڵاسم کە! " کوتی " دەورێکە دە نێوان من و تۆ دا. "**

**مووسا وەئاگا هات. دیتی بۆتە دڵبەر، شەم مردووە، ساقی خەوتووە ـ**

**خۆزگە بەوەی کە بەندەیەک ببینێتەوە و چیرۆکی مووسا و خزری دە دڵی دا ڕاگرێ و بیکاتە ئیمامی خۆی.**

مەولەویی ئەو عالیمی دینیی و مووسایە بوو کە هێشتا وە ئاگا نەهاتبوو شەمس هات و وە ئاگای هێنا و خۆی دوای ماوەیەک وەک خزر ڕۆیشت و کەس نەیدیتەوە.

**" حەزرەتی مەولانا لە سەر درەکەی حوجرەی مەولانا شەمس بە مرەککەبی سوور بە دەسخەتی مەبارەکی سەبتی فەرموو کە: مەقامی مەعشووق خزر عەلیهەسسەلام " (ئەفلاکی ٧٠٠)**

شەمس دووجار غەیبەت دەکا. یەک: دوای یەکەم ساڵی ئاشنایەتییان لەبەر تیر و تانەی خەڵک و ئێرەیی مریدەکانی مەولانا، کە ئەویان بە چاوبەست و جادووگەر دادەنا کە هاتووە شێخەکەی وانی ئەفسوون کردووە.

ئەفلاکی دەنووسێ:

**وەختایەک ئەو هاودەمیی و دوورەپەرێزیی و خەلوەتە لە حەدد تێپەڕی، گشت خەڵکی قۆنیە وە کوڵ هاتن و خۆشەویستان و یاران لە تاو غەیرەت و ئێرەیی شێوان و هێچکەس بۆی مەعلووم نەبوو کە ئەو چ کەسە و لە کوێوە هاتووە؛ وێکڕا تەمای ئەو گەورەیان کرد ... حەزرەتی مەولانا شەمسەددین غەیبەتی کرد؛ نزیک مانگێک لێیگەڕان شوێنەوارێکیان نەدیتەوە کە چی لێهات و چوو کوێ. " ل ٨٨**

**هاوار هاوار کە بەستی نیگار باری سەفەر**

**هاوار کە بەندە بۆی نەبووم بە یاری سەفەر**

مەولەویی دوای ئەو غەیبەت و سەفەرە، جلی عالیمانەی فڕێ دا و فەرجیی و کڵاوی پەشمیی لە سەر نا و لەبری نوێژ و کۆڕ و وەعز، دەستی کرد بە ڕوباب لێدان و غەزەل کوتن و سەما کردن وەها کە هەموو خەڵکی زانا و نەزان کوتیان کە **" حەیف نازەنین پیاوێک و عالمێک و پادشازادەیەک کە لەپڕ دێوانە بوو "**

**ئەو دڵبەری عەییاری جگەرخارەیی من کوا؟**

**ئەو خوسرەوی شیرینی شەکەرپارەیی من کوا؟**

**بێ سوورەتی ئەو مەجلیسی ئێمە نمەکی نیە**

**ئەو پڕ نمەک و پڕ فەن و عەییارەیی من کوا؟**

**لاواز بووە مانگی فەلەکیش زۆر لە خەمی ئەو**

**ئەو زوهرەیی پڕ بەهرەیی سەییارەیی من کوا؟**

**لە فیرقەتی ئەو دڵبەرە دەردێکە لە نێو دڵ**

**دەرمانی دڵی دەرد و دەوای چارەیی من کوا؟**

**چۆتە زولەمات بۆ تەڵەبی ئاوی حەیات خزر**

**ئەو کانی حەیاتەی پڕی فەوارەیی من کوا؟**

**گیان چەشنی مەسیحێکە لە نێو بێشکەی قالب**

**ئەو مریەمی بەستێنەری گەهوارەیی من کوا؟**

**دانیشتوو لە هەر کونج و پەنا دڵپڕی مەخموور**

**ئەو ساقیی دەریا دڵی خەممارەیی من کوا؟**

**کوا بووژێنەری دیوار و دەر و حەوشی لەشی من**

**ئەو ڕەونەقی میچ و سەر و دیوارەیی من کوا؟**

**شەمسولهەقی تەوریز لە کوێی تۆ و لە کوێ نی**

**ئاوارە لە دوات ئەو دڵی ئاوارەیی من کوا؟**

دوای ماوەیەک نامەیەک لە شەمس دەگا، کە لە دیمشقە. مەولەویی، سوڵتان وەلەدی کوڕی دەگەڵ بیست مریدی یار دەنێرێ و داوای گەڕانەوە و لێبووردوویی لێدەکەن و شەمس دەگەڕێتەوە. دەو سەفەری گەڕانەوە دا سوڵتان وەلەد دەبێتە مریدی شەمس و هەتا قۆنیە بە پێیان دە

خزمەت شەمسی سوار دا دەگەنە قۆنیە. مەولانا شاد و خۆشحاڵ و گەش لە گەڕانەوەی مەعشووق دەست دەکا بە سەماع و غەزەل.

**دانیشتوو لە نێو ماڵ بوتی عەییار هەیەتی کەس؟**
**مەعشووقی قەمەڕوویی شەکەربار هەیەتی کەس؟**

**زۆر زەحمەتە بۆ دیدە ڕوخی خۆر ببینێ**
**بێ پەردە، عەیان تاقەتی دیدار هەیەتی کەس؟**

**ئێژی لە خەرابات ئیدی نیمە چ کارێک**
**خۆی کاری تۆ شاکارە، وەها کار هەیەتی کەس؟**

**ڕندانی سەبووحی هەموو موخموور و خومارن**
**ئەی زوهرە کلیلی دەری خەممار هەیەتی کەس؟**

**من توتی غەیبییم و شەکەرچێژە و ئاشق**
**ئەو کانگەیی شیرینە بە قەنتار هەیەتی کەس؟**

**یەک غەمزەیی دیدار پترە لام لە دینار**
**دیدار کە بدا دەست خەمی دینار هەیەتی کەس؟**

**گیان کاتێ ڕێگەی راو لە ئەو شێرەیە فێر بوو**
**ئێستا وەکوو سەگ مەیل بە مردار هەیەتی کەس؟**

**چون عەینی عەیانە، چ دەدەی لاف لە ئیقرار**
**ئیقرار کە نەمێنێ ئیدی ئینکار هەیەتی کەس؟**

**ڕوخساری تۆ وەک زەلزەلەیی ڕۆژی قیامەت**
**لەو جەننەتی پڕ حوسنە خەمی نار هەیەتی کەس؟**

**بەو غەمزە و غەممازیی ئەو یاری وەفادار**
**بیر و خەفەتی عالەمی غەددار هەیەتی کەس؟**

**ئەی موتریبی خۆش لەهجەیی شیرین دەمی عارف**
**یارییم بکە و بێژە وەها یار هەیەتی کەس؟**

**بازاری بوتان بێ برەو و ساردە لەبەر تۆ**
**بازار چیە و مەیلی بە بازار هەیەتی کەس؟**

**ئەمڕۆکە لە سەودات نیەتی کەس سەری سەردار**
**دەستار هەیەتی کەس؟ سەری دەستار هەیەتی کەس؟**

**شەمسولهەقی تەوریز کە نەغد هات و وەدەرکەوت**
**کێ دەدوێ لە پار و خەمی پێرار هەیەتی کەس؟**

ماوەیەک پێکەوە دەبن و مەولەویی تەنانەت کچێکی نێو حەرەمی خۆی بە ناوی کیمیا لێ مارە دەکا، هەتا بەشکەم شەمس بار و بنەی بخا و لە پەنا و هاوسای بە خێر و خۆشی بیگوزەرێنن.

**ئەی خودا ئەم وەسڵە قەت هیجران مەکە**
**سەرخۆشانی ئەشق تۆ ناڵان مەکە**

**باغی گیان هەر تازە و شین ڕاگرە**

**قەسدی ئەم بێستان و ئەم مەستان مەکە**

**وەک خەزان زەرد دامەیە سەر بەرگی دڵ**

**خەڵک بێ ئەنوا و سەرگەردان مەکە**

**ئەو درەختەی بۆتە هێلانەی مەلت**

**مەیشکێنە ماڵە مەل وێران مەکە**

**شەمع و جەمعی ئاشقان تۆ تێکمەدە**

**دوژمنانم کوێر بکە، شادان مەکە**

**کەعبەی هیوای خەڵک ئەو کۆڕەیە**

**کەعبەیی هیواکەمان داغان مەکە**

**ئەو تەنافی خێوەتە تۆ تێکمەدە**

**خێوەتی خۆتە دەسا سوڵتان مەکە**

**نیە دە عالەم دا لە هیجران تاڵتر**

**هەرچی پێتخۆشە بکە، هیجران مەکە**

بەڵام دیسان دوای ماوەیەک نارەزایەتی دەست پێدەکاتەوە و مرید و کەس و کاریش لێی وە خۆ دەکەون و تەنانەت گۆیا بە حەوت کەسان دەیکوژن کە یەک لەوان کوڕی مەولەویی - عەلائەددین مەحەممەد - بووە. بە هەر حاڵ شەمس بۆ جاری دووهەم و بۆ هەمیشە ون دەبێ. مەولەویی غەمین و پەرێشان لێیدەگەڕێ و سوراغی لە هەموو جێ دەپرسێ و نایبینێتەوە.

**بووه لە خەمت خانەی سەودا دڵم**
**بۆ تەڵەبت چۆتە هەموو لا دڵم**

**بۆ تەڵەبی زوهرە ڕوخی مانگڕوو**
**سەیر دەکا لای سەر و باڵا دڵم**

**بوومە بە فەرشی خەمی ئەمما لە بەخت**
**چۆتە سەر و بانی موسەففا دڵم**

**ئاخ کە ئەمڕۆ چیەتی ئەو دڵەم**
**دوێنێ چ کەس دواندوویە ئاوا دڵم**

**بۆ تەڵەبی گەوهەری هەرمانی ئەشق**
**بۆتە شەپۆل هەروەکوو دەریا دڵم**

**ڕۆژ گەیشت چادری شەو داکەوت**
**دوای هەموو ئەو عەیش و تەماشا دڵم**

**نوکتە گەلێکن لە دڵت لای دڵم**
**ئاخ چ ڕێیەک لە دڵت تا دڵم**

**گەر تۆ نەکەی بەو دڵەیەم ڕەحمەتێک**
**وای دڵم  وای دڵم  وا دڵم**

**بۆ هەوەسی شەمسی دڵ و دینی من**
**چەندە دەکا ڕوو لە سورەییا دڵم**

ماوەی دوو ساڵ گەڕان و لێگەڕان و تەنانەت گوێ بە درۆ خۆش کردن بۆ بیستنی خەبەرێک لە شەمس، کە ئەگەر کەسێک پێیکوتبا شەمسم لە شام دیوە دەسبەجێ فەرەجی خۆی پێدەبەخشی. جارێک عەزیزێک بە مەولەویی دەڵێ کە درۆ دەکەن ئەوانە. مەولەوییش دەڵێ " دەزانم. من ئەو جلانە لە مزگێنی درۆکەیان دەدەم کە ئەگەر ڕاست با گیانم دەدا. " - مەولەویی ئیدی شەمس نابینێتەوە، بەڵام لەو غەیبەتەی شەمس پەی بە وجوودی شەمسی دەروونیی و مەعنەویی خۆی دەبا. شەمسێک کە دە قالبی ئەو دایە و لە ڕاستی دا شەمس و مەولەویی هەر یەکن و یەک کەسن و زێڕی بێخەوشی ئەشق لەو بۆتەیە سەرڕێژ بوو.

ئەفلاکی دەنووسێ " **هەرچەند حەزرەتی مەولانا، شەمسەددینی بە سوورەت لە دیمشق نەدیتەوە، بەڵام عەزەمەتی ئەو و شتێکی دیکەی دە خۆ دا دیتەوە و ئەشقبازیی دایم دە گەڵ خۆی دەکرد.**" (ل ٦٩٩)

**ئەی ئاشقان ئەی ئاشقان، ئەو ئاشقی یەکتا منم**
**کاتێک کە ئەشقم دێتە سەر، دێوانە و شەیدا منم**

**ئەو ئاشقی شەیدا منم، دێوانە و واڵا منم**
**لێرەم منم لەو لا منم، نە ژێر و نە باڵا منم**

**دەریای بێپایان منم، ئەو نووحی کەشتیوان منم**
**یۆسف منم عیسا منم، مووسا و هەم شەعیا منم**

**هەم ئەحمەد و حەیدەر منم، هەم بادەی ئەحمەر منم**
**هەم خاوەنی کیشوەر منم، لەو بادەیەی تەقوا منم**

**هەستاو منم، وەستاو منم، پەیدا منم، بەرجا منم**

**شاراوە نیم شاراوە نیم ئەو میر و مەولانا منم**

**وەک بولبولی گۆیا منم، وەک هەر گوڵی بۆیا منم**

**جۆیای جانانە منم، فاش و نەهان جۆیا منم**

**هەم کێو و هەم سەحرا منم، هەم گەوهەر و دەریا منم**

**لە نێو گرفەی گڕی ئەشق ئەو وێژەری گۆیا منم**

**زاهید وەرە، زاهید وەرە، زوهدت هەتاکوو فێر بکەم**

**هەم زاهیدم هەم عابیدم، هەم رند و هەم وەستا منم**

**ئەی شەمسی دین، ئەی شەمسی دین، رۆشنکەری ڕووی زەمین**

**لە نێو زەمین و ئاسمان، شاراوە و پەیدا منم**

## سەلاحەددینی زەرکووب

سەلاحەددینی زەرکووب مریدی سەیید بورهانەددینی موهەقیق بوو و هەر ئەودەمەش کە مەولەویی مریدی سەیید بوو، یەکتریان دەدەیت. سەیید دەیکوت **" من لە حەزرەتی شێخم سولّتانەلعەلەما دوو نەسیبی گەورەم پێگەیشتووە. یەکیان فەساحەتی قال، دووهەم سەباحەتی حال؛ قالی خۆم دا بە مەولانا جەلالەددین و حالی خۆم دا بە شێخ سەلاحەددین "** لە دوایی دوای مەرگی سەیید ڕۆژێک لە کۆڕێک کە مەولەویی وەعز دەکا، خۆی دەخاتە بەر پێی مەولەویی و دەبێتە مریدی. سەلاحەددین و مەولانا یەکتریان خۆش دەویست، بەڵام لەبەر غەنیمێکی وەک شەمس ئەو خۆشەویستییە خۆی تەواو دەرنەخست. مەولەویی دوای گەڕانەوە و نەدیتنەوەی شەمس ڕوو دە ئەشقی سەلاحەددین دەنێ و ئەو دەکاتە شێخ و جێگری خۆی.

سەلاحەددین کابرایەکی زێڕینگەری ئوممی و بێسەوادی خەڵکی قۆنیە بوو کە تەنانەت فاتحەی بە غەڵەتەوە دەخوێندەوە و لەبری قفڵ دەیکوت قوفڵ و بە موبتەلای دەکووت موفتەلا و هەر ئەوەش خەڵک و مریدەکانی هارووژاند کە خۆزگە بەوەی یەکەم، کە کابرایەکی زانا و تێگەیشتوو و زیرەک بوو ئەوەیان خۆ هەمووومان باش دەیناسین، کە چ کابرایەکی هیچ نەزان و نەخوێندەوارە و شایەنی شێخایەتی و لیاقەتی پێشەوایەتی نییە. بەڵام مەولەویی گوێی نەدا بەو قسانە و تەنانەت لەبەر پشتگریی و بە هێند نەگرتنی خەڵک لە کوێ بۆی هەڵکەوتبا ئەویش دەیکوت قوفڵ و موفتەلا. (ئەفلاکی ل ٧١٨) وەختایەک کوڕەکەشی هۆی ئەو خۆشەویستییەی لێپرسی، کوتی کە **" لەبەر مناسبەت و جنسیەتێکی تایبەت خۆشم دەوێ؛ هەر ئەوجۆرەی بە**

**حوکمی جنسییەت کاربا کا دەڕفێنێ... کە دە نێوانیان دا چ مناسبەتێک نیە یا دەیلاغێک کە وەدوای دایکی گولی دەکەوێ ئەگەر کەسێک ئەسپێکی عەرەبی هەزار دیناریی بێنێ کە ها وەدوای ئەو ئەسپە عەرەبیە بکەوە!... هەرگیز بە شوێنی دا ڕاناکا. هەر بۆیەش کەس دایکی خۆی لەبەر ئەوە خۆش ناوێ کە نان و هەڵوای دەداتێ، بەڵکە لەبەر مناسبەتێک خۆشی دەوێ " (ئەفلاکی ل ٧١٣)** هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە فاتمەی کچی سەلاحەددین بۆ سوڵتان وەلەدی کوڕی بخوازێ هەتا پەیوەندییەکە قووڵتر و نزیکتر بکاتەوە و لە باوەشی هەراوی ئەو دەشتە پاک و سافەی سەلاحەددین دا ڕووباری ئەشقی بەرەو دیارێکی دیکە تێپەڕێنێ.

شەمسی تەورێزیی کە هێرش دەباتە سەر زۆربەی مەشایخ و زانایان و خوێندەواران، بە سەریان دا دەگوڕێنێ کە: قسەی ئێوە کوا؟ ئەوەی ئێوە دەیڵێن گشتی قسە هێناوە لە کتێب و کەسانی دیکەیە؛ سەبارەت بە سەلاحەددینی ئوممی و نەخوێندەوار دەڵێ کە " خودا دەزانێ کە لە قسەکانی ئەو زێڕینگەرە حەیران دەبم، وەک کەسێک کە پەتبازێک چاو لێبکا لە سەر پەت، لە سەر بەرزایی دلێر و بێباک پەتبازیی دەکا، ئەو تەماشاچییە دڵی دادەکەوێ. " و ئەو پێهەڵکوتنە شاعیرانە لە زمان شەمسەوە نیشان لە عالەمێکی دیکەی دوور لە تەحسیلە و شارەزایی و لێهاتوویی سەلاحەددین نەک وەک ڕێبوارێکی ساکار دەو بوارە دا کە وەک پەتبازێک لە سەر بەرزایی بە سامی هەڵدێرەکانی قسە و کەلام.

بە هەر حاڵ، مەولانا و سەلاحەددین ماوەی دە ساڵ پێکەوە بوون و لە ئاکام مەرگ هات و سەلاحەددینی برد و وەسیەتیشی کرد، کە لەبری شین و شەپۆڕ بە دەنگی دەهۆڵ و تەپڵ و ڕوباب و نایە بینێژن. مەولەویی

خۆی هەتا سەرقەبران بە سەماع ڕۆیشت و لە پەنا قەبری سوڵتانەلعولەما ناشتیان.

**ئەی لە هیجرانت زەمین و ئاسمان گریان**
**دڵ دە نێو خوێن دا شەلاڵ و ئەقڵ و گیان گریان**

**چون دە عالەم دا نیە کەس بۆ مەکانی تۆ عەوەز**
**بۆ عەزات شینگێڕ مەکان و لامەکان گریان**

**شین دەکەن باڵ و پەڕی خۆیان پەری و جبرییل**
**ئەنبیا و ئەولیا دوو دیدەکان گریان**

**ڕاستییەکەی سەد جەهان بووی و نەبووی یەک تاکە کەس**
**دوێنی دیتم ئەو جەهان بۆ ئەم جەهان گریان**

**غەیرەتی تۆ گەر نەبا فرمێسکەکانم هەڵدەڕشت**
**ئێستێ خوێنی دڵ دەڕێژم من نەهان گریان**

**مەشکی پیویستە چ جێی ئەشک هیجری تۆ**
**هەر نەفەس خوێناوی خوێنە و هەر زەمان گریان**

**داخەکەی من داخەکەی من داخەکەم**
**بۆ وەها چاوی عەیان چاوی گومان گریان**

**شا سەلاحەددین رۆیی، ئەی هومای ڕووگەرم**
**تیژ دەرچووی هەروەکوو تیر و، کەوان گریان**

**بۆ سەلاحەددین کوا دەزانێ هەر کەسێک بگری**
**ئەوکەسە لازم بزانێ بۆ کەسان گریان**

## حیسامەددینی چەلەبی

دوایین مەنزڵ لەو ڕێگە پڕ پێچ و خەمەی مەولەویی، حیسامەددینی چەلەبی بوو.

حیسامەددین لە تەمەنی شازدە ساڵەیی باوکی کە یەک لە گەورەکان و پێشەوایانی تەریقەتی فتووەت و جوامێران بوو، دەمرێ. تەواوی مەشایخ و پیاوچاکان و گەورەکانی فتووەت بۆ لای خۆیان بانگی دەکەن، بەڵام ئەو بە ماڵ و حاڵ و لالا و کەسەکانیەوە یەکڕاست ڕوو دە حەزرەتی مەولانا دەنێ. حیسامەددین کانیاوێکی چووکە بوو کە لە پەنا کانیاوی بە تەوژمی مەولەویی هەڵقوڵی و هیز و وزەی خۆی لە ئیختیار وی نا. حیسامەددین هاودەم و هاوڕێی سەفەری مەعنەویی مەولەویی بوو. حیسامەددین مەحرەمی خەلوەتی شەمس و مەولەویی بوو، هاوسەفەر و یاری غاری مەولەویی لە سەفەری شام بوو. حیسامەددین ئاوێنەیەکی باڵانوێن بوو بۆ مەولەویی. سپەهسالار دەنووسێ **" عینایەتێک کە حەزرەتی خوداوەندگار بەو هەیبوو بە هیچ یەک لە خەڵیفەکانی نەبوو و وەهای دەگەڵ دەجووڵاوە کە کەس گومانی دەبرد کە مەگەر ئەو مریدە " ( ل ١٢١)** و لە کۆڕ و میوانییەک ئەگەر چەلەبی لێنەبا قسەی نەدەکرد. موعینەددینی پەروانە میوانییەکی دا. مەولەویی خامۆش دانیشتبوو و وەختایەک پەروانە زاواکەی بە شوێن حیسامەددین دا نارد و حیسامەددین هات. مەولەویی لە خۆشیان و لە خۆشەویستیان بەرەوپیری چوو و پێیکوت **" مەرحەبا گیانی من! ئیمانی من! جونەیدی من، نووری من، مەخدوومی من، مەحبووبی هەق، مەعشووقی ئەنبیا! " (ئەفلاکی ل ٧٧٠)** هەروەتر، لە کۆڕێکی دیکە،

وەختایەک شێخ شەرەفەددینی هەرەویی هات و لە سەرەوەی حیسامەددین دانیشت مەولەویی، حیسامەددینی بە چرا شوبهاند کە سەر و ژێر بۆ چرا تۆفیر ناکا **" چرا ئەگەر بەرزایی دەخوازێ بۆ خۆی ناخوازێ - مەبەستی ئەو قازانجی خەڵکە هەتا ئەوان لە شۆقەکەی حەز وەربگرن، دەنا، چرا لە هەرکوێ بێ، ژێر یا سەر، ئەو چرایە، هەتاوێکی ئەبەدیی. (فیهی مافیهی ل ٢١)**

**" ڕۆژێک حەزرەتی مەولانا خزمەتکارێکی دیت کە بە ئەشقەوە زەمبیلێکی لە سەر شانی داناوە و پێداویستی ماڵی حەزرەتی چەلەبی دەباتەوە. فەرمووی کە: بریا من لە جیات تۆ بام و تۆ من بای. " (ئەفلاکی ل ٧٨١)**

**" حەزرەتی مەولانا عادەتی وەها بوو کە هەرچی لە عالەمی غەیبی ئەمیران و ملووک و ئەکدەش و مریدانی ماڵدار لە ئەسباب و ماڵی دونیایی ناردبایان دەسبەجێ دەینارده لای چەلەبی حیسامەددین... ڕۆژێک ئەمیر تاجەددین... حەوتهەزار درەمی سوڵتانیی ناردبوو... فەرمووی کە هەمووی هەڵگرن و بیدەنە حیسامەددین. سوڵتان وەلەد [کوڕی مەولەویی] فەرمووی: دە ماڵ دا چمان نیە و پارەی خەرجییمان نیە و هەر فتووحێک کە دێ حەزرەتی خوداوەندگار دەینێرێتە خزمەت چەلەبی، ئەی ئەمە چ بکەین؟ فەرمووی کە: بەهائەددین وەڵڵا و بیللا و تەڵڵا کە ئەگەر سەدهەزار زاهیدی کامیلی موتتەقیی تووشی تەنگانە بێن و ترسی فەوتانیان هەبێ و من تاقە نانێکم هەبێ ئەویش بۆ خزمەتی چەلەبی حیسامەددین دەنێرم. " (ئەفلاکی ل ٧٥١)**

**وەی چەلەبی لە دەستی تۆ، لەو دەم و چاوی مەستی تۆ**
**سەد وەکوو دڵ شکەستی تۆ، وەی چەلەبی لە دەستی تۆ**

**ڕۆژ لە فیراقت دەمرم، شەو هەموو شەو من ئاگرم**
**خەمی گران هەڵدەگرم، وەی چەلەبی لە دەستی تۆ**

**جەور و جەفات من دەکێشم، ژارم بدەی من دەینۆشم**
**بە غەمی تۆ زۆر دڵخۆشم، وەی چەلەبی لە دەستی تۆ**

**جوان و لەتیف و دڵبەری، ناڕوانی و تێدەپەڕی**
**غەمی منت نیە لە بەری، وەی چەلەبی لە دەستی تۆ**

**پای ویساڵ بەستراو، بەندی دڵم سست و پساو**
**هەودای غەم پسێنراو، وەی چەلەبی لە دەستی تۆ**

**ڕادەبم و فەغان دەکەم، ڕازی دڵم عەیان دەکەم**
**شۆر لە نێو چەهان دەخەم، وەی چەلەبی لە دەستی تۆ**

**بۆچی بەرەو جەفا دەچی، باشتر بەرەو وەفا بچی**
**هی منی تۆ چما دەچی، وەی چەلەبی لە دەستی تۆ**

سەردەمی ئەشقی حیسامەددین و مەولانا دە ساڵ بوو. سەردەمێکی پوختەیی کە ڕووبار دەگاتە دەریا و هەگبەی دیاریی و بار و بنەی لە بن و لێواری دەریا هەڵدەڕێژێ.

وجوودی حیسامەددین بۆ مەولەویی پڕ لە خێر و بەرەکەت بوو. حیسامەددین وەک شاگردێک دایم لە بەر دەستی بووە و بەشێکی زۆر لە غەزەلەکان و قسەکانی مەولانا و تەنانەت شەمسیشی نووسیوەتەوە و ڕێکوپێکی کردوون. هەروەتر وەختایەک کە دەبینێ یاران و مریدانی مەولانا خەریکی خوێندنەوەی شوێنەوارەکانی سەنایی و عەتتارن، داوا لە مەولەویی دەکا کە غەزەلەکان هەرچەند زۆرن، بەڵام جێگەی شوێنەوارێکی وەکوو ئیلاهینامەی سەنایی یا مەنتقوتەیری عەتتار کە تێیدا باسی بیر و باوەڕەکانی ئەهلی تەسەووف بکا بەتاڵە. مەولەویی کە وادیارە خۆشی بەو ئاکامە گەیشتبوو هەر ئەودەم کوتە کاغەزێک لە دەستاری دەردێنێ و دەیداتە دەست حیسامەددین کە بە " گوێ بگرە لە نەی حەکایەت دەکا/ لە جودایی شکایەت دەکا " دەست پێدەکا و بریتی لە هەژدە بەیتە و دەبێتە سەرەتای مەسنەویی-یەک کە نزیک بە دە ساڵ دەخایەنێ. لە سەماع، لە حەمام و هەرکوێیەک کە با و گەڵێک جاران

سەر لە ئێواران مەولەویی دەستی پێدەکرد بە کوتن و حیسامەددین بە پەلەپەل دەینووسییەوە هەتا بەرەبەیان. دوایی بە دەنگی بڵند بۆی دەخوێندەوە، ئیسلاحیان دەکرد و لێیان زیاد و کەم دەکرد. ئاکامی ئەو هەوڵ و شەونخونیانە بوو بەرهەمێکی هەرمانی شەش بەرگی کە یەک لە شوێنەوارەکانی بە نرخ و گرینگ و گەورەی تەسەووفە.

**ع. ن هاوینی ۲۰۰٦ ستۆکهۆڵم**

لە سەر ژیانی مەولەویی و لە سەر بیر و جەهانبینی و بۆچوونەکان و تەفسیر و لێکدانەوەی مەسنەویی و شێعرەکانی، کۆمەڵێک مەولەوییناس و مەولەوییدۆست لە ڕوانگەی خۆیانەوە کتێب و مقالەی بە کەلکیان بە گەلێک زمان نووسیوە کە پێویستە زۆربەیان تەرجومە بکرێنەوە. ئەو بابەتەی کە خوێندتانەوە تەنیا و تەنیا باسێکی سەرەتایی و نواندی وێنەیەکی چووکە لە دەریایەک.

**ئاشقیی هەمووی ئەسیریی-یە و مەعشووقیی هەمووی ئەمیریی، چ مناسبەتێک هەیە دە نیوان ئەمیر و ئەسیر دا؟**

**ئەحمەدی غەزالیی**

١

گەر بڕوا دیدە و ئەقڵ و هزر و گیان تۆ مەڕۆ

کە لە لام دیتنی تۆ باشتر لە گشت وان تۆ مەڕۆ

ئەم هەتاو و فەلەکە گشتی لە سایەی سەری تۆن

گەر بڕوا ئەم فەلەکە و ئەختەری تابان تۆ مەڕۆ

ئەهلی ئیمان هەموو ترساوی دەمی کۆتایین

ترسی من ڕۆیینی تۆ ئەی شەهی ئیمان تۆ مەڕۆ

تۆ مەڕۆ گەرکوو دەڕۆی گیانی منیش هانێ بەرە

گەر منیش ناشێ ببەی دانیشە لامان تۆ مەڕۆ

هیجری خۆتم مەنوێنە هیجری تۆ دڵبەردە

گشت لە تۆ بۆتە لەعل سەنگی بەدەخشان تۆ مەڕۆ

کوا دەشێ زەڕڕە بە خۆر بێژێ مەڕۆ ڕاوەستە

کوا دەبێ بەندە ببێژێ بە تۆ سوڵتان تۆ مەڕۆ

تۆ بەڵام ئاوی حەیاتی، هەموو خەڵکان ماسی

وەرە بیکە کەرەم و ڕەحمەت و ئێحسان تۆ مەڕۆ

هەیە تۆماری دڵی من بە درێژایی ئەبەد

گشتی نووسراوە لە سەر تا بن و پایان تۆ مەڕۆ

٢

ژێی چەنگی ئەقڵ ببڕین، تارێک من و تارێک تۆ

سازی دڵمان لێدەین، جارێک من و جارێک تۆ

ئێمە هەموو هەر یەکین، موشتاقی یەکیی و وەحدەت

ئەمما کە قسە بێژین، یارێک من و یارێک تۆ

وەک ئەحمەد و بووبەکرین، دانیشتوو لە کونجی غار

دوویی دەبێ بێشک گەر، غارێک من و غارێک تۆ

لەو عالەمی خارستان، سەیر و سەفەرم زۆر کرد

دەرکێشین لە پا ئێستا، خارێک من و خارێک تۆ

سەرمەست بنوو ئەی دڵ، پشتبەستی مەسیحی خۆ

ئەو کاتە نەما ئیدی، زارێک من و زارێک تۆ

من نوقم لە کانی زەر، تۆ سوجدەبەران ئەی سەر

بێکار نەبین باشە، کارێک من و کارێک تۆ

هەرکەس کە دەبێ جۆیام، با بێتە سەری کۆی تۆ

گەر لەیلی و مەجنوونن، بارێک من و بارێک تۆ

ڕێگر کە ڕێگا بگرێ، ناچار سزا دەدرێ

ئێستاکە بڵا لێیدەین، دارێک من و دارێک تۆ

خامۆش کە خامۆشییی، فەخرێک من و فەخرێک تۆ

بۆ دواندن و بێسەبریی، عارێک من و عارێک تۆ

## ٣

وەرن دەی وەرن دەی بۆ مەیدانی خەرابات
مەترسن مەترسن لە هیجرانی خەرابات

شەهەنشا شەهەنشا ئەوە بەزم دەگێڕێ
ببێژن ببێژن بە ڕندانی خەرابات

هەموو مەست و هەموو پەست وەرن قەسر و سەرایە
کە سوڵتانی سەلاتین بووە میوانی خەرابات

هەموو مەست و خەراون، هەموو دیدە پڕ ئاون
وەکوو خۆر بدرەوشێن لە هەیوانی خەرابات

هەموو دیدە و گیانن، هەموو لوتف و ئەمانن
هەموو سەروی ڕەوانن، لە بوستانی خەرابات

وەرن ژوور وەرن ژوور، مەترسن مەترسن
گوناهکار دەبەخشێ بە سوڵتانی خەرابات

## ٥٣

شەو داهات بەڵام لە لایی ئەغیار

ڕۆژە شەوی من لەبەر ڕوخی یار

گەر گشتی عالەم دڕک دایگرێ

ئێمە لە دۆستمان غەرقین لە گوڵزار

جەهان خەراب بێ یاکوو ئاوەدان

مەستە دڵەکەم، خەرابە دڵدار

چون لە مەلوولیی بەدەر نیە خەبەر

بێخەبەرییە لام ئەسڵی ئەخبار

٥٤

به دڵ بێژه كه نەخوڵێتەوە لای خەم
كه چونكه خەم به خواردن ناكرێ كەم

گژ و گیای ئاو و گڵ گشتی خەمین بوون
كه بەزمی ئەو نیه بێجگه له ماتەم

مەچۆ دەوروبەری خەم ئەی مەلی دڵ
به خەم نابێ پەڕ و باڵی تۆ مەحكەم

له دونیای بێخەمیی باڵێك دەرسكێ
كه ناخوازی ئیتر تۆ گەشتی عالەم

دڵا لەش دوژمنی كۆنینی تۆیه
كه نابێ كۆنەدوژمن خاڵ و یا عەم

سەرت سەخت كه، له خۆ دوور كه مەلوولیی
مەلوول قەت نابێ بۆ ئەسرار مەحرەم

ببە ماسی لە نێو دەریای مەعانی

کە بێجگە ئاوی خۆش ناخوازێ هاودەم

مەلالی نیە دە دەریا دا چ ماسی

کەچی بێ ئاو و دەریا نابێ خوررەم

هەیە دەریایەکی پەنهان لە عالەم

کە تێیدا ناژی هیچکەس بێجگە ئادەم

لە حەیوانیی هەتا دەرباز نەبن خەڵک

مەحاڵە ئاوی حەیوان دەسکەوێ هەم

خەمۆش بە لەو قسانە پیاوی مەعنی

نیە کاری نە لای **لا** و نە لای **لەم**

## ٥٥

ئەشق دەگەڵ گفت و دەگەڵ ئیما چ کار

ڕووح دەگەڵ ڕوخسار و ڕووی ئەسما چ کار

ئاشقان وەک گۆن لە پێش چەوگانی یار

گۆ دەگەڵ دەست و پەل و دوو پا چ کار

هەرکوێ چەوگان لێیبدا بۆ وێ دەچێ

گۆ دەگەڵ خوار و دەگەڵ باڵا چ کار

بۆتە ئاوێنە دەنوێنی ڕووی بوتان

ئەو دەگەڵ ڕووخۆش و بەدسیما چ کار

ئەو خەیاڵەی کە زەمیر بۆی بوو وەتەن

سەرپەنا و مەسکەن و جێگا چ کار

تێپەڕی عیسا ئەگەر چوو بۆ عەرش

ئەو دەگەڵ سەرما و کەش و گەرما چ کار

ئەی کە بوویە هاودەم و هاوڕازی غەیب

تۆ دەگەڵ گفت و دەگەڵ غەوغا چ کار

٥٦

هیچ کارێک نیە لەو دونیایە، تا کەنگێ گڵکاریی بکەم

هیچ حاجەتی نیە یار بە من، تا یارمەتی و یاریی بکەم

من خاکی تیرە و تار نیم، تا با ببا بەر بام بدا

من ئاسمانی شین نیم تا خەرقە ژەنگاریی بکەم

دوکان چما دانێم کە ئەو، بازار و دوکانی منە

سوڵتانی گیانم من چما وەک بەندە چەکداریی بکەم

دوکانی خۆم وێران دەکەم، دوکانی من سەودای ئەوە

گەر کانی لەعلم دیتەوە، بۆچی دوکانداریی بکەم

کاتێک کە نەشکاوە سەرم، بۆچی ببەستم من سەرم

چون من تەبیبی عالەمم، چیم داوە بێماریی بکەم

من بولبولی باغی دڵم، نەنگە ئەگەر کوندیی بکەم

وەک گوڵ گوڵاوی گوڵشەنم، حەیفە ئەگەر خاریی بکەم

چون بوومە نێزیک من لە شا، لە ناکەسان دووریی دەکەم
چون خۆیی من بوو ئەشقی ئەو، لەو خۆیە بێزاریی بکەم

زنجیر لە سەر دەستم دەنێ، گەر دەست بەرم بۆ کاری دی
دە نێو مەی دا نوقمم دەکا، گەر مەیلی وشیاریی بکەم

ئەی خواجە من جامی مەیم، چۆن شیشە (سینە) من غەمگین دەکەم
شەمع و چرایی عالەمم، بۆچ خانە من تاریی بکەم

یەک شەو وەرە میوانەکەم، تا مانگەشەو پێشکەش بکەم
داینێ دڵت لە پێشی من تا لوتف و دڵداریی بکەم

دڵ دامەنێ لای غەیر و کەس، نیە گەوهەرێک هاوتای من
هاسان وەرە و هیچ غەم مەخۆ، بێ تاکوو غەمخواریی بکەم

ئەی موتریبی سیاحەبنەزەر، ئەو پەردە لێدە تا سەحەر
زیندوو بژیم و زیندەسەر، تا کەنگێ مرداریی بکەم

وایدانێ ئەوشۆ شەوگەڕی، یاکوو لە لایی دڵبەری
بێخەو ببە هەروەک پەری، تا من پەریداریی بکەم

سەر لە بەیان دەف دەژەنم، چونکە زەماوەندێ دەکەم

ئاگر لە چادر بەردەدەم، تا کەنگێ خۆشاریی بکەم

چون من دەگەڵ شەمسولهەقم ، هەمخوو و هەمڕازم نها

وەک شەمس لە شەش لاوەش دەبێ، شەمسانە ئەنواریی بکەم

## ٥٧

ئەشق ببینە تێکەڵاوی ئاشقان
ڕووح ببینە تێکەڵاوی خاکدان

چەند دەبینی هۆو و ئەم، چاک و خراپ
سەیر کە ورد، تێکەڵاو بوون گشت شتان

چەند دەبێژی ئەم جەهان و ئەو جەهان
ئەم جەهانە تێکەڵاوی ئەو جەهان

چەند دەکەی باسی نیشان و بێنیشان
هەر نیشانەن تێکەڵاوی بێنیشان

دڵ وەکوو شا هات و ئەزمان تەرجومان
شا ببینە تێکەڵاوی تەرجومان

تێکەڵاو بن چونکە قازانجی مەیە
وا زەمین بوە تێکەڵاوی ئاسمان

ئاو و ئاگر تۆ ببینە و با و خاک
دوژمنانن تێکەڵاو وەک دۆستان

گورگ و بەرخ و شێر و ئاسک، چوار دژ
تێکەڵاو بوون وا لە سامی قارەمان

ئەندەروونت کفر و دین، گورگ و مەڕن
تێکەڵاون وەک دوو یاری مێهرەبان

سەیری شایەک کە لە لوتفی زۆری ئەو
تێکەڵاو بوون نێو بە نێو دڕک و گوڵان

سەیری ئەو هەورە بکە لە فەیزی ئەو
تێکەڵاون ئاوی چەندین ناودان

یەکیەتی ئاکام ببینە و تێبگە
نەوبەهارە تێکەڵاوی مێهرەگان

گەرچی دژ دەنوێنێ، چەوت دیاریی دەکەن
هەروەکوو تیر تێکەڵی ماڵی کەوان

قەند بێژە و بیمژە و پێت حەیف بێ
قەند و پەند بن تێکەڵاوی نێو دەمان

شەمسی تەورێزیی وەها دەڕوێ لە دڵ
کەس نیە وا تێکەڵی ڕووح و ڕەوان

٥٨

ئەی لە هیجرانت زەمین و ئاسمان گریان

دڵ دە نێو خوێن دا شەڵاڵ و ئەقڵ و گیان گریان

چون دە عالەم دا نییە کەس بۆ مەکانی تۆ عەوەز

بۆ عەزات شینگێڕ مەکان و لامەکان گریان

شین دەکەن باڵ و پەڕی خۆیان پەری و جبرەییل

ئەنبیا و ئەولیا دوو دیدەکان گریان

داخەکەم دەو ماتەمەم دا پێمنەما هێزی وتار

دەربڕم سۆزێک لە تاو ئازیزەکان گریان

ڕاستییەکەی سەد جەهان بووی و نەبووی یەک تاکە کەس

دوێنی دیتم ئەو جەهان بۆ ئەم جەهان گریان

غەیرەتی تۆ گەر نەبا فرمێسکەکانم هەڵدەڕشت

ئێستێ خوێنی دڵ دەڕێژم من نەهان گریان

مەشكی پیویستە چ جێی ئەشك هیجری تۆ

هەر نەفەس خوێناوی خوێنە و هەر زەمان گریان

داخەكەی من داخەكەی من داخەكەم

بۆ وەها چاوی عەیان چاوی گومان گریان

شا سەلاحەددین ڕۆیی، ئەی هومایی ڕووگەرم

تیژ دەرچووی هەروەكوو تیر و، كەوان گریان

بۆ سەلاحەددین كوا دەزانێ هەر كەسێك بگری

ئەوكەسە لازم بزانێ بۆ كەسان گریان

## ٥٩

مەیژەنە  پەردەی دیکە بێجگە نەوای دڵداری من

ئەو هەزاران یۆسفی شیرینی شیرینکاری من

یۆسفانی مەست کرد و پەردەکانی دادڕین

غەمزەیی چاوانی مەستی ئەو شەهی خەمماری من

بۆ نەوایی ئەشقی ئەو سەد نەوبەهاری سەرمەدیی

سەدهەزار بولبول دەخوێنن خۆش لە نێو گوڵزاری من

دڵ کە زونناری لە ئەشقی ئەو مەسیحەی عەهد بەست

نابەچار غەیرەت دەبا ئیمان بە ئەو زونناری من

خۆرەتاوێک نەک لە شەرق و نەک لە غەرب، لە گیان هەڵات

زەڕڕە ئاسا دێنە ڕەقس دەرک و دەر و دیواری من

چونکە هەروەک زەڕڕەیکم من بە شوێن ئەو خۆرەوە

هەروەکوو زەڕڕەش سەمایە ڕۆژ و شەو کرداری من

ئاشقانی ئەشق گەلێک یاریدە و یاریی دەدەم

چونکە شەمسەددینی تەورێزیی نها بوو یاری من

٦٠

ئەی یاری من ئەی یاری من،  ئەی یاری بێ زینهاری من
ئەی دڵبەر و دڵداری من،  ئەی مەحرەمی ئەسراری من

ئەی لە زەوی بۆ من قەمەر، ئەی نیوەشەو بۆ من سەحەر
ئەی لە خەتەر بۆ من سپەر، ئەی هەوری شەککەرباری من

خۆش دەچیە نێو گیانی من، خۆش تۆ دەکەی دەرمانی من
ئەی دین و ئەی ئیمانی من، ئەی بەحری گەوهەرداری من

بۆ شەڕەوانی مەشعەلە،  بۆ بێ دڵانی سلسلە
ئەی قیبلەیی هەر قافلە،  ئەی کاروانسالاری من

هەم ڕێگری هەم ڕێبەری،  هەم مانگی و هەم مشتەری
هەم ئەو سەرەی هەم ئەو سەری،  هەم گەنج و ئیستزهاری من

وەک یۆسفی پێغەمبەری،  دێی و دەخوازی مشتەری
تا ئاگری تێبەربدەی ، لە میسر و لە بازاری من

تۆی مووسایی سەر تووری من، تۆی عیسایی ڕەنجووری من

هەم نووری نووری نووری من، هەم ئەحمەدی موختاری من

هەم هاودەمی زیندانی من، هەم دەوڵەتی خەندانی من

سەرتر لە گشت کەسانی من، زۆرتر لە سەد هەزاری من

دەڵێی " ڕابە دەنگ هەڵبڕە! " " من چی بڵێم حاڵم شڕە؟ "

دەڵێی " وەرە لە هۆ گەڕە، ئەی بەندەیی تەراری من "

دەڵێم " گەنجێکی شایەگان " دەڵێی " بەڵێ نەک رایەگان

گیان دەخوازم ئەویش چ گیان! " " دەی هەڵگرە لە باری من "

" گەر گەنج دەخوازی سەر بدە گەر ئەشق دەخوازی گیان بدە

وەرە نێو سەف خۆ دوا مەدە، ئەی حەیدەری کەراری من "

## ٦١

تۆ نەقشی، نەقشبەندان کوا دەزانی؟

تۆ شکڵی، پەیکەری، گیان کوا دەزانی؟

تۆ خۆت نابیسی قەت دەنگی دەهۆڵێ

تۆ ڕازی سڕڕی پەنهان کوا دەزانی

خەبەردار نی لە کافی کوفرەکەی خۆت

تۆ ڕاستییەکانی ئیمان کوا دەزانی

دڕووت هێشتا دە پێ دا ماوە، ڕۆنێ

تۆ شیناوەرد و بێستان کوا دەزانی

درەختی شین دەزانێ قەدری باران

تۆ ویشکی قەدری باران کوا دەزانی

سولەیمانییت نەکردە پیشەیی ئەشق

زمانی مار و مووران کوا دەزانی

نیگەهبانە خودا حازر لە سەر تۆ

تۆ حەیوانی نیگەهبان کوا دەزانی

تەجەللی کرد ئێستا شەمسی تەورێز

تۆ دێوی، نووری ڕەحمان کوا دەزانی

## ٦٢

دڵا گەر تالبی یاری، لە خۆ دەرچە و لە بێگانە

فەنایی جسم و گیان یانی فەنایی شەمع و پەروانە

بە کوللی ڕووت لە لای هەق بێ، حەدیست ئەشقی موتڵەق بێ

نەکا ئەقڵت لە مل تەوق بێ، ببە تۆ مەست و دێوانە

بەقاخوازی، فەنایی بە، لە خۆ دەرچە خودایی بە

غوڵامی بێنەوایی بە، ڕەها کە خوێش و بێگانە

ئەگەر تەوحیدە یەکتایی، لە سەر عالەم چما ماویی

ئەگەر هاومەزهەبی ئێمەی، وەرە بۆ کونجی مەیخانە

قەلەندەروار بخۆوە مەی، لە جامی وەسڵی ئەو دڵبەر

مەڕوانە نەقشی کوفر و دین، هەموون تەقلید و ئەفسانە

سقاهم ربهم حازر، تەهوورە ئەو مەی تاهر

هەر ئەو ئەووەڵ هەر ئەو ئاخر، هەر ئەو ساقی و پەیمانە

له ئه‌شقی توڕڕه‌كانی ئه‌و، كه‌ لوول و شاخ شاخ هاتن

دڵی میش شاخ شاخه‌ تیژ، وه‌كوو ده‌نكی سه‌ری شانه

ده‌مێكی ڕووبه‌ڕووی دڵبه‌ر، له‌ عومری جاویدان خۆشتر

ڕه‌وان به‌ شه‌مسی ته‌ورێزیی، به‌ره‌و لای گه‌نجی وێرانه

## ٦٣

هەرکەسێک تێیدا نەبێ لەو ئەشقە ڕەنگ

لای خودا هیچ نیە جگە لە دار و سەنگ

دەردەکێشێ ئەشق لە بەرد ئاوی ڕەوان

دادەماڵێ ئەشق لە هەر ئاوێنە ژەنگ

دەم دەپچڕێ ئەشق لە نێو دەریای دڵ

هەڵدەلووشێ دوو جەهان هەروەک نەهەنگ

کوفر ڕووی کردە شەڕ و ئیمان لە سولح

ئاگری لێدان ئەشق گشت سولح و جەنگ

ئەشق وەک شێرە، بەبێ مەکر و فریو

نابێتە جار ڕێوی و جارێک پڵەنگ

ئەشق ئەگەر بێ، گشت دەبن حەیران و مەنگ

ئەقڵ سەری لێ گێژ و گیان بۆتە دەبەنگ

چون لە ئەشق هێز و وزەی زۆر پێدەگا

گیان دەفڕێ لەو لەشی تاریک و تەنگ

چون لە تەورێزە شەمس، تۆش ئەی سەبا

عەرزەیی خزمەت بکە زوو بێ درەنگ

٦٤

ئاشقیی و بیر لە دوایی و ناو و نەنگ

ناشێ بۆ ئەشق، تێیگرە پلار و سەنگ

دوورکەوە هەرچی شەل و لەنگت بکا

ڕێگە دوور و بەردەڵان و لەنگ لەنگ

مەرگ ئەگەر مەردە لە لای من بێتە دەنگ

تا هەمێزی تێوەرێنم تەنگ تەنگ

من لە ئەو گیانێ دەبەم بێ ڕەنگ و بۆ

ئەو لە من دەلقێ دەسێنێ ڕەنگ ڕەنگ

جەور و زوڵمی دۆست لە سەر گیان دابنێ

یا دەنا لێدە سەڵایی جەنگ جەنگ

گەر تەراش و مشتوماڵت نیە گەرەک

هەروەکوو ئاوێنە بە نەک ژەنگ ژەنگ

دەست لە سەر چاوت بنێ و بێژە بە چاو

چاو هەڵێنە و زەق مەڕوانە مەنگ مەنگ

هەر لە ئێوارە هەتاکوو بەربەیان

دایمەنێ موتریب دەمێکی چەنگ چەنگ

شەمسی دین و شەمسی دین، هەر بێژە بەس

تا لە تاوانی نەبین گێژ و دەبەنگ

## ٦٥

کەنار و بنەی نیە بیابانی من

قەراری نیە هیچ دڵ و گیانی من

جەهانەوجەهان نەقش و ڕوخساری گرت

کیهایە لەوان نەقشی نەقشانی من

کە دیتت لە ڕێگا براوەسەرێک

دەخوا تل دەڕوا لایی مەیدانی من

مەترسە و بپرسە لە ئەو سیرڕی من

دەبیسی لە ئەو سیرڕی پەنهانی من

چ دەبوا کە پەڕوازە بووبا مەلێک

ملی تەوقی سیرڕی سولەیمانی من

چ دەبوا کە دەست کەوتبا گوێچکەیەک

کە بیستبای قسەی تەیر و تووڕانی من

چ دەبوا کە دەست کەوتبا چاوی وا
کە دیبای بەر و باری دارانی من

چ دەبوا شەپۆلێکی پڕبار و بەرز
بڵند با لە سەر بەحری عوممانی من

نە حەوت ئاسمان، چون لە عەرش نزمترن
بەرزتر لە عەرشیشە جەولانی من

چ جێگەی هەوا و بەهەشت و فەلەک
لە گوڵزاری وەسڵانە سەیرانی من

چ بێژم کە هەردەم پتر دەمبەدەم
پەرێشانترە ئەو پەرێشانی من

وەکوو باز و نێچیری کەو، وێککەون
لە بانسەر هەوای بەرزی کوێستانی من

لە بانسەر هەوایەک کە حەوتەم هەوا
بەرزتر لە وانیشە کەیوانی من

چ بێژم کە نەمزانی ئەو باسە وا
گەلێک زێدە لەو حەددی ئیمکانی من

لە ئەو داستانە مەپرسە کە چون
شکاوە و نەماوە چ دەستانی من

سەلاحی هەق و دین دەنوێنێ بە تۆ
جەمالی شەهەنشا و سولتانی من

## ٦٦

ڕندان سەلامت لێدەکەن، گیان وەک غولامت لێدەکەن

داوای دوو جامت لێدەکەن، مەستان سەلامت لێدەکەن

دە ئەشق دا من فاشترین، لە گشتیان قەڵلاشترین

لە دڵبەران خۆشباشترین، مەستان سەلامت لێدەکەن

سەیرکە غەوغای ڕووحانیی، سەیرکە سێڵاوی تۆفانیی

سەیرکە خورشیدی رەببانیی، مەستان سەلامت لێدەکەن

ئەی ئارەزوویی ئارەزوو، پەردە لادە دەی زووبە زوو

من ناناسم غەیری ئەو ڕوو، مەستان سەلامت لێدەکەن

ئەی هەوری خۆشباران وەرە، ئەی مەستیی یاران وەرە

ئەی شای تەراران وەرە، مەستان سەلامت لێدەکەن

حەیرانم کە بێ ڕەنجم کە، وێرانم کە پڕ گەنجم کە

نەغدی ئەبەد هاوسەنگم کە، مەستان سەلامت لێدەکەن

شارێک لە تۆ وێرانەسەر، هەم بێخەبەر هەم باخەبەر

لە تۆ دڵە سیاحەبنەزەر، مەستان سەلامت لێدەکەن

بەو میری مانگڕوویە بێژە، بەو چاوی جادوویە بێژە

بەو شایی خۆشخوویە بێژە، مەستان سەلامت لێدەکەن

بەو میری غەوغایە بێژە، بەو شۆر و سەودایە بێژە

بەو سەروی خەزرایە بێژە، مەستان سەلامت لێدەکەن

بەو جامی بێچوونە بێژە، بەو داوی مەجنوونە بێژە

بەو دوڕی مەکنوونە بێژە، مەستان سەلامت لێدەکەن

بەو دامی ئادەمە بێژە، بەو گیانی عالەمە بێژە

بەو یار و هاودەمە بێژە، مەستان سەلامت لێدەکەن

بەو بەحری مینایە بێژە، بەو چاوی بینایە بێژە

بەو تووری سینایە بێژە، مەستان سەلامت لێدەکەن

بەو جەژنی قوربانە بێژە، بەو شەمعی قورئانە بێژە

بەو فەخری ریزوانە بێژە، مەستان سەلامت لێدەکەن

ئەی تۆ حیسامەددین شا، ئەی فەخری گشتی ئەولیا

گیانمان لە گیانت ئاشنا، مەستان سەلامت لێدەکەن

٦٧

خواجە هەڵەت کردووە، لەو ڕەوشەی یاری من

سەد وەکی تۆ ون دەبن، لە نێو من و کاری من

هەر مل و گەردن نیە، لایقی شەمشیری ئەشق

شێوی سەگان کەی دەخوا، شێری دڕ و هاری من

شەپۆلی من کەی دەبا، تەختەی هەر کەشتییەک

شۆرەزەوییت نایمژێ، هەوری گوهەرباری من

کوتت کە " ئاشق چما، مەست دەبێ و بێحەیا؟ "

بادە حەیا کەی دێڵێ، خاسە لە خەمماری من

لەو گەڕ و بازاری ئەو، کێ دەکڕێ گورگی پیر

هەر تەڕەفێک یۆسفێک، هەیە لە بازاری من

بۆ وەکوو تۆی کوندەبوو، باغی ئیرەم نیە جێگەی

بولبول گیان تێینەکەوت، ڕێگە لە گولزاری من

موفخەری تەورێزیان، شەمسی هەق و دین، بڵێ

چونکە سەدای تۆیە دێ، لەو هەموو گوفتاری من

## ٦٨

خۆزگە ئاگادار نەبا بێجگە لە تۆ قەت گیانی من
پێینەزانیبا بە غەیرت گیانی مانازانی من

غەیری ڕووت هەرچی دەبینم نووری دیدەم کەم دەبێ
هەرکەسێک ڕێگە مەدە ئەی پەردەیی چاوانی من

گیان وەها ناسک وەها تەسک لەو هەموو لوتفەی ئەشق
نامەوێ دڵ نامەوێ گیان، کوانێ هی من جوانی من

چەشنی هەورم ڕووترش لە غەیرەتی شیرینی خۆ
ڕوویی هەروەک خۆرەتاوت بەسە بۆ بورهانی من

وەرمەچەرخێنە لە من ڕووت، با نەگەوزێم من لە دەرد
چەرخ نەسووتێنێ، گڕی گەردانی ئاگردانی من

تاکوو خامۆشم لە گوڵزارت دەبەم ڕەیحان و گوڵ
گەر بناڵم پڕ دەبێ عالەم لە بۆی ڕەیحانی من

کێم لە ئاست تۆ کێم ئەمن؟ ئەوکەسەی ناوم بنێی

کێی لە لای من کێی ئەتۆ؟ سوڵتانی من سوڵتانی من

ئەی کە تۆ لە گیانی من لە - ئەفغانی من نزیکتری

یاکوو ئەفغانم لە تۆ دێ یا ئەتۆی ئەفغانی من

## ٦٩

نەعرەتەیەک هات لە دڵ و گیانی من

ئاخ لە مەعشووقەیی پەنهانی من

سوجدەگەیی ئەسڵی من و فەرعی من

تاجی سەری من، شەهـ و سوڵتانی من

خەستە و بەستەن دڵ و دەستانی من

دەستی غەمی یۆسفی کەنعانی من

دەست دەنوێنم کە برینداری کێن؟

ئێژیٚ لە دەستی من و دەستانی من

دڵ دەنوێنم کە پڕی خوێن بووە

پێدەکەنێ شاهی دڵستانی من

پێمدەڵێ هەروا بە بزە شوکر بکە

جەژنی منە ئەی ئەتۆ قوربانی من

کوشتە و قوربانی کێم؟ پێمدەڵێ کە:
هی منی تۆ بۆ من و پەیمانی من

پێدەکەنێ لێ پڕی نم چاوی من
دیتی مەلەک دیدەیی گریانی من

ڕەحمی بە من هات و وە ڕێی خست ئاو
هەڵقوڵی جا کانیی حەیوانی من

ئاوی حەیاتە دەڕژێ و دێتە دەر
تێر دەکا سەدرەیی ئیمانی من

بەندەیی ئەو ئاوەم و ئەو میری ئاو
بەندەتریش ئەو دڵی حەیرانی من

بەس بکە خامۆش، مەکە هیچ قسە
ئیدی لە لای شاهی نەهانزانی من

٧٠

حەرامە ئەی موسڵمانان لە نێوماڵی دەروون ڕۆیین
شەرابی ئەرغەوان دانان، بە دەنگی ئەرغەنوون ڕۆیین

لە دەر هەر زەرق و بەرقە من هەزاران جار دیتوومە
لەمەودوا ئەبلەبییە گەر بەرەو وا ئازموون ڕۆیین

لە شەم فێر بە بزانە چۆن دەگەڵ گریانێ دێ قاقای
لە چاو فێر بە بڕوانە چۆن بە وەستاویی و سکوون ڕۆیین

ئەگەر ڕۆژێ بتوانی تۆ لە ئوستادان دەرس فێر بی
دەتوانی وەک مەلی ئازاد بەرەو ئاسۆی ڕوون ڕۆیین

کە تاسێک سەرنخوون بکرێ دەڕێژرێ هەرچی تێیدایە
کەچی سەودا چ ناتوانێ لە تاسی سەرنخوون ڕۆیین

کە نازی کەس دەکێشی تۆ بکە نازی وەها شایەک
کە زۆر بێبەختییە دیسان لە ژێر گەردوونی دوون ڕۆیین

له زانستان دەشۆرم دڵ، له خۆیی خۆم دەبم غافڵ

كه بۆ لای دڵبەری مەقبووڵ ڕەوا نیه زووفنوون ڕۆیین

دەناسێ گیانی مەجنوونان، دەزانێ گیانه توێژی گیان

وەها زانین و زانستێک به زانستی جنوون ڕۆیین

بڵا با ئەو بکا ڕاوێژ، كه تۆ خامۆش، بکه تۆبه

كه ئەو دڵداره خووی وایه بەرەو لای تایبوون ڕۆیین

٧١

تاسەبارت بێقەرارم ڕۆژ و شەو

چاوەڕوانیی بۆتە کارم ڕۆژ و شەو

ڕۆژ و شەو مەجنوون دەکەم من چەشنی خۆم

شێت و شەیدا و لێوبەبارم ڕۆژ و شەو

گیان و دڵیان گەر دەوێ لە ئاشقان

دڵ سپێرم گیان نیسارم ڕۆژ و شەو

هەر کە ئەشقت دەستی دایە موتریبی

جار چەنگم جار تارم ڕۆژ و شەو

لێمدەدەی تۆ زەخمە و بۆ سەر دەچێ

بەرزی بەرز هاواری زارم ڕۆژ و شەو

چل سەباحێک بوویە ساقی ئادەمیی

لەو هەوێنە من خومارم ڕۆژ و شەو

ڕەشمەیی ئاشقان بە دەستی تۆوەیە

من لە ڕیزی ئەم قەتارەم ڕۆژ و شەو

بێخەبەر بارت دەکێشم مەستی مەست

وشترێکم، ژێری بارم ڕۆژ و شەو

تا بە قەندت ڕۆژوو نەشکێنم ئەمن

تا قیامەت ڕۆژوودارم ڕۆژ و شەو

گەر لە خوانی فەزلی ئەو ڕۆژوو بخۆم

جەژنە دایم ڕۆژگارم ڕۆژ و شەو

گیانی ڕۆژ و گیانی شەو ئەی گیانی تۆ

چاوەڕوانم، ئینتزارم ڕۆژ و شەو

تاکوو سالێک نیم ئەمن دەربەستی جەژن

مانگی ڕووت دەیدا قەرارم ڕۆژ و شەو

ئەو شەوەی وەعدەی بدا بۆ ڕۆژی وەسڵ

ڕۆژ و شەو بوونە ژمارم ڕۆژ و شەو

بەس کە مووچەی مێهری گیانم تینووە

هەوری دیدەم پڕ، دەبارم ڕۆژ و شەو

## ٧٢

فەقیرە ئەو فەقیرە ئەو، فەقیر ئیبنی فەقیرە ئەو
خەبیرە ئەو خەبیرە ئەو، خەبیر ئیبنی خەبیرە ئەو

لەتیفە ئەو لەتیفە ئەو، لەتیف ئیبنی لەتیفە ئەو
ئەمیرە ئەو ئەمیرە ئەو، ئەمیری مڵکگیرە ئەو

پەناهە ئەو پەناهە ئەو، پەناهی هەر گوناهە ئەو
چرایە ئەو چرایە ئەو، چرایی بێنەزیرە ئەو

سکوونە ئەو سکوونە ئەو، سکوونی هەر جنوونە ئەو
جەهانە ئەو جەهانە ئەو، جەهانی شەهد و شیرە ئەو

کە ڕازی خۆت لە لا درکاند هەموو عالەم دەزانن ئەو
وە گەر بیشارییەوە تێبگە، کە زانایی زەمیرە ئەو

ئەگەر هیچکەس وە خۆت نەگرێ، بە جێ ناهێڵێ تۆ تەنیا
وەرە بن باڵی ئەم شایە، کە شایی ناگوزیرە ئەو

بەرەو خەرمانی ئەو ڕاکە، کە سەرسەوزت دەکا ئەی گیان
پەنا بۆ دامەنی ئەو بە، کە دەفعی تیغ و تیرە ئەو

هەچی داوا بکا لە تۆ، لە سەر چاو و سەری دانێ
لە هەرچێکی دەترسی تۆ، پەنا و دەستگیرە ئەو

ئەگەر تاوان و کوفریش بێ، وە یا گەر دێوی دژوێن بێ
کە خۆری دەربخا تیشکی هەموو بەدری مونیرە ئەو

دەگەڵ ئەشقە کە من دەدوێم، لە ئەشقە من دەرس دەگرم
بەرەو ئەو ڕادەکێشم گیان، کە زۆر زۆر کەمپەزیرە ئەو

بوتێکت هەس لە نێو پەردە، بوتێکی جوان بەڵام مردە
وەهای مەگرە دە باوەش خۆت، کە سارد و زەمهەریرە ئەو

وەکوو بووکێکی ڕازاوە، لە دەست و پێ خەنەی ناوە
دە چارشێو دا جەوان دیارە، بەڵام پەتیاری پیرە ئەو

ئەگەر ئەو شێری نەڕ بایە، دەبا چێشتی جگەر بایە
کەچی وەک یووزە ڕەفتاری، کە جۆیای پەنیرە ئەو

نیەتی فەڕڕی سوڵتانی، نەشێ بۆ دەرک و دەربانی

لە خۆراکی ئەشق دا ئەو، وەکوو سەلکێکی سیرە ئەو

دڵم دەکوڵێ و دەخوازێ لێی، کە هەڵبوقوڵێ دووسەد کانی

دەبەستێ ڕێگەی ئاوم، لە ڕێ گرتن نەکیرە ئەو

## ٧٣

شتێک وەک بەرق لێدەدرێ عەجایب دڵستانە ئەو؟

لە هۆو سووچە چ دەترووسکێ؟ عەجایب لەعلی کانە ئەو؟

چیە لە دوور وەکوو گەوهەر؟ عەجایب مانگە یا ئەختەر؟

کە وەک قەندیلی نوورانیی مەعلەق لە- ئاسمانە ئەو

دەڵێی قەندیلی گیانە ئەو درەفشی کاویانە ئەو

عەجایب شەمعی گیانە ئەو کە نووری بێکەرانە ئەو

ئەگەر بتکاتە دوڕئەفشان دەبی نادیار و بێ نیشان

بپارێزە نیشانەی ئەو لە نێو ئێمە نیشانە ئەو

ئەرێ ئەی دڵ هەڵێنە سەر کە چاوی تۆیە ڕووناکتر

دەبینی و گەلێک باشتر چیە گشت ئەو شتانە ئەو

دەنوێنێ ساکین و بزوێن نە بزوێنە و نە ساکین ئەو

دەنوێنێ جێ و مەکانێک ئەو هەقیقەت بێمەکانە ئەو

كە ئاوێکی بجوولێنی لە نێوان نوورە ئەکسی ئەو

دە تەشت دا جوولەکەی دیارە کەچی هی ئاسمانە ئەو

نە ئەمیانە و نە هینە ئەو سەلاحەددین و دینە ئەو

ئەگەر هاودەم ئەمینە ئەو دەبێژم پێی فلانە ئەو

٧٤

ئەگەرچی زۆر درەنگ هاتی، وەرە مەردانە ئەی ساقی

بپێوە پێنج پەیمانە بە یەک پەیمانە ئەی ساقی

لە جامی بادەیی عەرشی، بشێوێنە دەر و حەوشی

دەبینی گەنجی ژێر فەرشی لە نێو وێرانە ئەی ساقی

ئەگەر جامێکی بشکێنم، وە یا مەجلیس بشێوێنم

لە من مەگرە، منم بێ دڵ ئەتۆی فەرزانە ئەی ساقی

ئەگەر ڕووحانیی بێ شووشە، بزانە بادەکەی چۆنە

دەبێژم من نیە باکم ئەتۆی لەم خانە ئەی ساقی

لە ئاو و گڵ بنێ پێیەک، کە گیان ئاو و لەشە وەک گڵ

جیا کە ئاو و گڵ لێکتر، وەکوو کا و دانە ئەی ساقی

لە ئاو و گڵ دەکەن لێرە گەلێک خانوو و کاشانە

لە ئاو و گڵ خەلەل پێکدێ لە سەر کاشانە ئەی ساقی

بژی شەمشیری پڕ گەوهەر، کە ناوی بادەیە و ساغەر
ببڕە زوو ئەتۆی حەیدەر سەری بێگانە ئەی ساقی

نەماوە یەک سەری ئاشق، هەمووت لێدان و ئاسوودە
سەری ئەو شەمعە هەڵبڕە تۆ فەرڕاشانە ئەی ساقی

بە وشیاریی قسەم نایە، خەرابم کە خەرابم کە
بە جامێکی قسەبەخشی لەتیف ئەفسانە ئەی ساقی

سقاهم ربهم گاهێ دەکا دێوانەیەک ئاقڵ
کەچی گاهێ هەیە ئاقڵ دەکا دێوانە ئەی ساقی

خەمۆش بە و مەیکە گریانی، موقیمی گیانی گوڵزاری
ببە شاد و بخۆوە مەی، مەیی شاهانە ئەی ساقی

٧٥

له ڕۆژی مەرگم دا کە تابووتم بوو ڕەوان
پێتوانەبێ کە هەمبوو خەمی ئەم جەهان

بۆ من مەگری و مەڵێ هەیهات هەیهات
هەیهات دە داوی دێو کەوتنە لامان

مەیتم کە دەبینی مەڵێ هەیڕۆ ڕۆڕۆ
ویسال و مولاقاتی منە ئەو زەمان

دە گۆڕم کە دەنێی مەڵێ وەداع وەداع
کە گۆڕە پەردەی جەمعیەتی جینان

ئاوا بوونت کە دی ئەنگووتن ببینە
ئاوا بوونی خۆر بۆ هەیەتی زیان

تۆ لات ئاوابوونە بەڵام ئەنگووتنە
لەحەد وەک حەپس و ڕزگارە گیان

کام دان چوو ژێر خاک و سەری هەڵنەدا؟

بۆ لە دانەی ئینسانت هەیە گومان

کام دۆڵچە چوو خوار، پڕ نەهاتەوە سەر؟

لە چاڵی یۆسفی گیان بۆچ هەبێ گریان

دەمت کە بەست لەم لایە، لەو لا بیکەوە

کە های و هووت دەگا لە هەوای لامەکان

٧٦

تۆ بۆ من گیان و جەهانی، بۆچمە گیان و جەهان من

تۆ بۆ من گەنجی ڕەوانی، بۆچمە سوود و زیان من

نەفەسێک یاری شەرابم، نەفەسێک یاری کەبابم

کە لە نێو دەوری خەرابم، بۆچمە دەوری زەمان من

لە هەموو خەڵک ڕەویوم، لە کەلێنێکی خزیوم

نادیارم لە پەسیوم، بۆچمە کەون و مەکان من

لە ویسالی تۆ خومارم، لای خەڵک چی هەبێ کارم

کە بۆ تۆ سەید و شکارم، بۆچمە تیر و کەوان من

کە لە بن جۆگەی ئاو دام، بۆچ بڕۆم؟ بۆچمە ئاو من

چ دەتوانم چی بڵێـم من، سفەتی جۆیی ڕەوان من

لە تۆ هەر زەڕڕە جەهانێک، لە تۆ هەر قەترەیە گیانێک

کە گەیشت لە تۆ نیشانێک، بۆچمە ناو و نیشان من

دەس بخەم گەوهەری فایق، لە بنی بەحری هەقایق

بە سەرم ڕێگە دەپێوم، بۆچمە پایی ڕەوان من

بە سەلاحی ئەحەدیی تۆ، ڕێگر و ڕێگەبڕی تۆ

جلوبەرگت هەموو بردم، چ دەمە باجگران من

لە تروسکەی مەهی تابان، لە خەمی توڕڕەیی پێچان

دڵەکەم سووک بووە ئەی گیان، تێدەکەم ڕەتڵی گران من

سەیر مەکە ڕەنج و بەڵا تۆ، سەیر بکە ئەشق و شەفا تۆ

سەیر مەکە جەور و جەفا تۆ، سەیر دەکەم سەد نیگەران من

لەقبی لوتف دەدەمە غەم، دەیکەمە شادیی بەڵاش هەم

هەر لە ئەو چاکە تەڵەب کەم، فەرەج و ئەمن و ئەمان من

دەمەوێ ئەمن و ئەمان من، هاودەمی گۆشەگران من

دەگرم گوێ لە قسان من، دەگرم رێی زمان من

٧٧

پێشتر وەرە ئەی سەنەمی شەنگی من

ئەی سەنەمی هاودڵ و هاوڕەنگی من

شین دەگێڕم کە دڵم تەنگ بووە

تاکوو بڵێی پێم وەرە دڵتەنگی من

چەشنی عەوان جەنگ دەگەڵ دڵ دەکەم

تاکوو بڵێی تۆی سەر و سەرهەنگی من

چەندە دەپرسی کە ڕوخت زەردی چیە؟

هی غەمی تۆیە بوتی گوڵڕەنگی من

دوێنێ شەوێ زوهرە هەمووی بیست بە گوێ

شین و شەپۆڕی لەشی وەک چەنگی من

بکرەوە گیانم لە لەشم، بمبەوە

بێتە ڕەها گیانی پڕی نەنگی من

ئاشت بکەوە گیانی من و خۆیی من

بۆ تۆیە گشتی شەڕ و گشت جەنگی من

پام لە با تیژتر و خۆشتر دەڕوا

گەر تۆ بڵێی دا وەرە ئەی لەنگی من

بۆیە ئەمن بەستە و ئاوێزی تۆم

تاکوو ببێ وەک شەکەر ئاونگی من

تۆ لە منی فارغ و من زار زار

ئاخ چ دەبێ گەر بکەی ئاهەنگی من

دووریی ڕێگا و درەنگ بوون چ نیە

نیو قەدەمە ڕێگەیی فەرسەنگی من

پیریی من باشتر لە گشت لاوەتی

گەش بووە ڕوخسارەیی پڕ ژەنگی من

دەنگ مەکە بێدەنگ بە وەکوو گێژ و مەنگ

تا بڵێ پێت دا وەرە بێدەنگی من

٧٨

نەخەوی ئەوشۆکە ئەی گیان چ دەبێ
دانەخەی دەرکەیی هیجران چ دەبێ

گەر شەوێک تاکوو بەیان بێدار بی
بۆ ڕەزا و خاتری یاران چ دەبێ

گەر دوو دیدە بە تۆ ڕووناک و گەشن
کوێر ببێ دیدەیی شەیتان چ دەبێ

داپپۆشێ لە گوڵ ئەفشانیی تۆ
هەموو عالەم گوڵ و ڕەیحان چ دەبێ

ئاوی حەیوان کە لە تاریکییە
پڕ بکا شار و بیابان چ دەبێ

وەک خدر گەر تۆ ببی ڕابەرمان
تا سەری چاوەیی حەیوان چ دەبێ

گەر لە خوان و کەرەم و نیعمەتی تۆ

ژەمی ژین کەن دوو سێ میوان چ دەبێ

گەر لە دڵداریی و گیانبەخشیی تۆ

گیان بخوازن دوو سێ بێگیان چ دەبێ

گەر بە سواریی دێیە مەیدانی وجوود

بەر و سینەم ببێ مەیدان چ دەبێ

ڕوویی وەک مانگت ئەگەر بنوێنی

تا بچی زوهرە بە میزان چ دەبێ

تێیکەی گەر قەدەحێک لیپاولیپ

بیدەیە دەستی خوماران چ دەبێ

گەر بپۆشین لە خەڵات و جلی نوێ

ئەم غەڵامانی تۆ سوڵتان چ دەبێ

بەسە دڵ مەیکە فەغان بێدەنگ بە

گەر نەبێژی تۆ پەرێشان چ دەبێ

٧٩

عەجەب ئەو دڵبەرە زیبایە چوو کوێ

عەجەب ئەو سەروی خۆش باڵایە چوو کوێ

لە نێومان دایسا هەروەک شەمێک بوو

ئەما ئێستا دەپرسم خوایە چوو کوێ

دڵم هەروەک گەڵایەک دێتە لەرزە

شەوە و ئەو دڵبەرە تەنیایە چوو کوێ

بڕۆ سەر ڕێ و بپرسە ڕێبواران

کە ئەو هاوڕایە گیانەفزایە چوو کوێ

بڕۆ باغ و بپرسە باغەوانان

کە ئەو شاخی گوڵی ڕەعنایە چوو کوێ

بڕۆ بان و بپرسە پاسەوانان

کە ئەو سوڵتانی بێهاوتایە چوو کوێ

وەکوو دێوانە ئاوارەم لە سەحرا
کە ئەو ئاسکە لە ئەو سەحرایە چوو کوێ

دوو چاوم هەروەکوو جەیحوون لە گریان
وەها دوڕڕێک لە ئەو دەریایە چوو کوێ

لە مانگ و زوهرە هەردەم من دەپرسم
کە ئەو مانگڕوویە لەو باڵایە چوو کوێ

ئەگەر هی ئێمە بوو ئەی بۆچی دوورە
ئەگەر هی ئێرەیە بۆولایە چوو کوێ

هەموو جێم دیت و نەمدیت ئەو لە هیچ جێ
دوو لەت بووم ئاخۆ ئەو یەکتایە چوو کوێ

دڵ و گیانی کە تێکەڵ بوو بە ئەڵڵا
ئەگەر ئاو و گڵە ئەو **لا**یە چوو کوێ

ببێژە ئاشکرا شەمسولهەقی دین
ئەگەر الشمس و لایخفایە چوو کوێ

٨٠

له خاکم گەر گەنم سەردەربهێنێ
ئەگەر نانی بکەن لێی، مەستیی دێنێ

هەویر و نانەوای دێوانه و شێت
تەنووری بەیتی مەستانە دەخوێنێ

ئەگەر بۆ زیارەتی قەبرم بەڕێوەی
گڵی گڵکۆم وە ڕەقسانت دەهێنێ

مەیە بێ دەف عەزیز بۆ سەر مەزارم
له بەزمی هەق نەشێ خەم بتگرێنێ

له کفنم بزگوڕێک بدروو له سینەت
خەراباتێک له گیانت پێکدەهێنێ

منی هەق ئافراندوه پڕ له مەی ئەشق
هەمان ئەشقم ئەگەر مەرگ بمڕفێنێ

منم مەستیی و ئەسڵم بادەیی ئەشق

لە مەی مەستیی نەبێ چم پێدەمێنێ

بەرەو بورجی ڕوحی شەمسولهەقی دین

ڕوحم دەفڕێ و دەمێکی ڕانەمێنێ

٨١

تەخت و نوغرۆی کرد جەهان، سەودای تۆ سەودای تۆ
چێژی عومرم هەر بووە هەڵوای تۆ هەڵوای تۆ

کۆشی گەردوون پڕ لە مرواری و دوڕ و لەعل و زەرە
تاکوو هەڵڕێژێ هەمووی ژێر پای تۆ ژێر پای تۆ

گیانی گشت ئاشق دەگەوزێن هەروەکوو سێڵاوی ئاو
تیژ بەڕێوەن بۆ بەرەو دەریای تۆ دەریای تۆ

من کە تێمڕوانی لە گیانی سادەیی بێرەنگی خۆم
نەقش زەردم دیت لەبەر سەفرای تۆ سەفرای تۆ

کاتێ ورد ڕوانیم لە گرشەی گەوهەری نێو زاتی تۆ
مانگ ڕوخی دەرخست لە نێو سیمای تۆ سیمای تۆ

من کوتم مانگ و لە ڕاوێژم گەلێک تاوان هەیە
مانگ مەگەر کێیە ببێتە تای تۆ هاوتای تۆ

ئاوەها ئێژێ خوداوەند شەمسی تەورێزیی بە ناو

ئەی هەموو شاری دڵم غەوغای تۆ غەوغای تۆ

## ٨٢

کە سەرمەستی منی ئەی گیان، لە دەردیسەر چما غەمتە
کە ئاسکی ناسکی من بی، لە شێری نەر چما غەمتە

کە مانگی ڕووی تۆ من بم، چ دەخوازی لە ساڵ و مانگ
کە هەتبێ سۆز و شەوقی من، لە شۆر و شەر چما غەمتە

کە بوویە کانگای هەنگوین، چما ڕووی تۆ وەها ترشە
کە ڕامت بێ بوراقی ئەشق لە مەرگی کەر چما غەمتە

کە من گەرم و گوڕم لای تۆ، چما ئاخت وەها سەردە
کە چوویە سەر سەری ئەفلاک، لە ویشک و تەر چما غەمتە

خۆشاوازیی منت بینی، دەواسازیی منت بینی
ڕەسەنبازیی منت بینی، لە سەر چەنبەر چما غەمتە

بە ڕواڵەت بۆچی نووساوی، لە بێ مانا چ ترساوی
دە باغەڵ دا هەبێ گەوهەر، لە بێ گەوهەر چما غەمتە

دەگەڵ دڵ یاری غاری تۆ، چراغی چاریاری تۆ

فەقیری زولفەقاری تۆ، لە تاو خەنجەر چما غەمتە

هەموو باغ و بەرت داگرت، بخۆ تێر لەو بەروبوومە

ئەگەر دەرگا دەبەستن توند، لە بەندی دەر چما غەمتە

کە مەدد و جەزری خۆت بینی، کە باڵ و پەڕی خۆت بینی

شکۆ و فەڕی خۆت بینی، لە هەر بێفەڕ چما غەمتە

ئەرێ ئەی گیانی گیانی گیان، پەناهی گیانی میوانان

ئەرێ سوڵتانی سوڵتانان، لەبەر سەنجەر چما غەمتە

خەمۆش بە هەروەکوو ماسی، بڕۆ نێو باوشی دەریای

کە ساکین بووی لە ژێر بەحری، لە تاو ئازەر چما غەمتە

٨٣

ئەی دۆست شەکەر خۆشتر یا کەس کە شەکەرسازە
جوان بوونی قەمەر باشتر یا کەس کە قەمەرسازە

ئەی باغ ئەتۆ خۆشتر بەو گوڵشەن و گوڵزارەت
یا کەس کە دەرسکێنێ و سەد نێرگزی تەرسازە

ئەی ئەقڵ ئەتۆ باشتر بۆ دیتن و بۆ زانین
یا کەس کە بە هەر ساتێک سەد ئەقڵ و نەزەرسازە

ئەی ئەشق ئەگەرچی تۆ شیواو و پەرێشحاڵی
ئەمما هەیە گڕکانێک لەو ئەشقە کەمەرسازە

بێخۆ و پەرێشانم، سەرگەشتە و حەیرانم
جارێکم دەسۆزێ پەڕ، جارێک پەڕ و سەرسازە

دەریای دڵەکەم لە لوتف پڕ خوسرەو و پڕ شیرین
هەر قەترەی ئەندێشە سەد جۆرە گوهەرسازە

ئەو گشت گوهەرانەش ئەو، دەشکێنێ لە بەر پێی ئەشق

لەو ئەشقە عەجیبەش ئەو سەد بەرهەم و بەر سازە

شەمسولهەقی تەورێزیی سەد جۆر دەگۆڕێ دڵ

جارێکی وەکوو شەمشیر، جارێکی سپەرسازە

٨٤

ئەگەر تۆ ئاشقی ماتەم ڕەها کە
زەماوەندی ببینە و خەم ڕەها کە

ببە دەریا و کەشتی وەربگێڕە
ببە عالەم هەموو عالەم ڕەها کە

وەکوو ئادەم وەرە جەننەت بکە تۆبە
بەر و منداڵی گشت ئادەم ڕەها کە

بڕۆ سەر چەرخ وەکوو عیسای مریەم
کەری عیسای کوڕی مریەم ڕەها کە

لە شەوقی ئەشقی یۆسف گەر بڕیت دەست
شەوق بگرە و خەمی مەڵهەم ڕەها کە

ئەگەر بێداری کردی زولفی دەرهەم
خەیاڵات و خەوی دەرهەم ڕەها کە

نفخت فيه من روحی گەیشتوە

خەمی زۆر و خەمی کەم کەم ڕەها کە

موسەڵلەم کە دڵت لە ژین مەسەڵلەم

هومێدی ناموسەڵلەم هەم ڕەها کە

لە شێرزا فێر ببە خوو و خدەی شێر

سەگی نادەستەمۆی ئادەم ڕەها کە

خەمۆش لەو چەشنە گوفتار و قسانە

قسەوێژی خودا ئەعلەم ڕەها کە

کە دەرکەوت شۆقی شەمسەددینی تەورێز

جەهانی تەنگ و تار و تەم ڕەها کە

٨٥

نیە وەک حوسنی تۆ جوان یاری دیکە
وەرە دەر مانگی جوانان جاری دیکە

لە لام غەیری تەماشای جەمالت
لە هەردوو عالەمان نیە کاری دیکە

لە حوسنی تۆی کەمێکی هەر دەبرد دز
ئەگەر وەک تۆ هەبا عەیاری دیکە

هەتاوی حوسن و جوانییت ڕووی وەدەرخست
لە هەر زەڕڕێکی دێ ئیقراری دیکە

وەهات دەریا لە گەوهەر ئاخنیوە
کە هەر قەترێک بووە عەنباری دیکە

لە ماڵێک دوو نەخۆشن ئاشق و شێت
منم بیمار و دڵ بیماری دیکە

خودایە هەر دوو لات تیمار کردن

بەڵام ماوە دیسان تیماری دیکە

چلۆنم تێدەگا مونکیر کە بێژم

کە پێناگا بە ئەو دیداری دیکە

کوتی مونکیر: سەنایی هەر ئەوەندەس

سەنایی دایە دەست خەرواری دیکە

وەها خەروار بە خەروار تۆ مەبینە

وە ئاگا دێنێ عیساواری دیکە

## ٨٦

بۆسۆی دڵی من نیشانەیی سەودایە

ڕەش دووکەڵی دڵ لە دوورەوە پەیدایە

هەر پێلە کە هەڵدەستێ لە خوێنی دڵی پڕ کوڵ

کوا وادەبێ دڵ مەگەر بڵێم دەریایە

لێم بوونە نەبان نزیک و ناسیاو و خزم

دڵ بۆچی ئیدی لە دوژمنییم هەستایە

هەرلا کە ئەشق گرتی بەر و ڕووی تێکرد

ئەو جێیە هەموو لۆمەیە هەر هەڵڵایە

گشت ئێرەیی پێدەبەن بە ئەشق تەنانەت شایان

چون ئەشق شەمی کۆڕ و دڵی واڵایە

پێ دانێ بڕۆ سەر سەری چەرخی حەوتەم

ئەو ئەشقە لە تەشقە لە سەر و باڵایە

وشیار مەبە دەمێک کە چونکە وشیار

بێنرخە لە لای ئەشق و گەلێک ڕیسوایە

میریی لە سەرت دەرکە کە میری مەجلیس

گەر چاوی سەری بەستوە بە دڵ بینایە

شەو ڕابن و هەستن ئەی حەریفان

مەی حازر و شەم نازر و یار تەنیایە

٨٧

دڵی و ڕادەبری خەرامان، گیانی گیان بێ من مەڕۆ
گەر دەچی بۆ بەزم و سەیران و گەڕان بێ من مەڕۆ

ئەی فەلەک بێ من مەچەرخە، ئەی قەمەر ڕووت دەرمەخە
ئەی زەوی بێ من مەڕسکە و ئەی زەمان بێ من مەڕۆ

ئەم جەهان خۆشە دەگەڵ تۆ، ئەو جەهانیش خۆش بە تۆ
لەم جەهان بێ من مەمێنە، بۆو جەهان بێ من مەڕۆ

ئەی عەیان بێ من مەزانە، ئەی زمان بێ من مەدوێ
ئەی نەزەر بێ من مەبینە، ئەی ڕەوان بێ من مەڕۆ

شەو لەبەر شۆقی تریفە گەش دەبێ ڕوخساری مانگ
من شەوم تۆ مانگی من، بۆ ئاسمان بێ من مەڕۆ

خار ئەیمەن بوو لە ئاگر چون پەنای بوو لەتفی گوڵ
تۆ گوڵی، من خاری تۆم بۆ بێستان بێ من مەڕۆ

گەر لە کۆڕی بەزمی شا بووی ئەی تەرەب بێ من مەنۆش

گەر دەچی سەربانی شا ئەی پاسەوان بێ من مەڕۆ

وای لەم ڕێبازە گەر کەس بێ نیشانی تۆ بڕوا

چون نیشانی من ئەتۆی، ئەی بێ نیشان بێ من مەڕۆ

وای لەم ڕێبازە کەس دەڕوا بەبێ زانست و هۆش

هۆش و زانستیش ئەتۆی ئەی ڕێگەزان بێ من مەڕۆ

خەڵکی تر ناوت دەنێن ئەشق، من دەڵێم سوڵتانی ئەشق

ئەی ئەتۆ سەرتر لە وەهمی گش کەسان بێ من مەڕۆ

٨٨

گەر شەمس و قەمەرخوازی، ها شەمس و قەمەر فەرموو

گەر سوبح و سەحەر خوازی، ها سوبح و سەحەر، فەرموو

ئەی یۆسفی کەنعانی، وەی گیانی سولەیمانیی

گەر تاج و کەمەر خوازی، ها تاج و کەمەر، فەرموو

ئەی هەمزەیی زەبر و زەنگ، ئەی روستەمی ڕۆژی جەنگ

گەر تیغ و سپەر خوازی، ها تیغ و سپەر، فەرموو

ئەی بولبولی خۆش ڕاوێژ، ئەی تووتی شیرین بێژ

گەر قەند و شەکەر خوازی، ها قەند و شەکەر، فەرموو

ئەی گیانی تەماشاخواز، مووسایی تەجەللیخواز

گەر سەمع و بەسەر خوازی، ها سەمع و بەسەر، فەرموو

ئەی دێوی پڕی کینە، ئەی دوژمنی دێرینە

گەر فیتنە و شەڕ خوازی، ها فیتنە و شەڕ، فەرموو

خامۆش! قسەت ببڕە، ڕێگەی سەفەرت بگرە

گەر یاری سەفەر خوازی، ها یاری سەفەر، فەرموو

شەمسولهەقی تەورێزیی، پڕ ناز و دڵاوێزیی

گەر خەستەجگەر خوازی، ها خەستەجگەر، فەرموو

## ٨٩

یار وەرە یار وەرە، ئەو چەل و ئەوجار وەرە

نا مەڵێ نا، با مەدە مل، ئەی مەهی عەییار وەرە

ئاشقی مەهجوور ئەمەین، عالەمی پڕ شۆڕ ئەمەین

تینووی مەخموور ئەمەین، ئەی شەهی خەممار وەرە

پا ئەتۆی، دەست ئەتۆی، خالقی هەر هەست ئەتۆی

بولبولی سەرمەست ئەتۆی، لایەنی گوڵزار وەرە

گوێچکە ئەتۆی، چاو ئەتۆی، سەرگوڵ و خۆشناو ئەتۆی

یۆسفی دزراو ئەتۆی، بۆ سەری بازار وەرە

بوویە نەهان لە دیدەکان، ئەی ئەتۆ گیانی گشت جەهان

جاری دیکە چەپڵەڕێزان، بێ دڵ و دەستار وەرە

ڕۆشنیی ڕۆژ ئەتۆی، شادیی غەمسۆز ئەتۆی

مانگی شەوی تار ئەتۆی، هەوری شەکەربار وەرە

ئەی عەلەمی عالەمی نەو، ئەقڵ لە لاتن بە گرەو
جار مەیە و جار مەڕۆ، هەستە بە یەکجار وەرە

ئەی شەوی شێواو بڕۆ، ئەی غەمی بێناو بڕۆ
ئەقڵی بەبێ چاو بڕۆ، دەوڵەتی بێدار وەرە

ئەی دڵێ ئاوارە وەرە، ئەی جگەری پارە وەرە
گاڵە دراوە دەرکە گەر، هەڵچە لە دیوار وەرە

ئەی نەفەسی نووح وەرە، ئەی هەوەسی ڕووح وەرە
مەڵهەمی مەجرووح وەرە، سیححەتی بێمار وەرە

ئەی مەهی ڕووگرژی جوان، ئاوی ڕەوانی و ڕەوان
شادییدەری گشت ئاشقان، کوێریی ئەغیار وەرە

بەسەی ئیدی ناتقی گیان، چەندە قسە و گفتی زمان
چەند دەکوتی تەپڵی بەیان، بێ دەم و گوفتار وەرە

**٩٠**

گرانگیانیی مەکە ئەی یار بێژە
لە زولفی خۆت و ئەو ڕوخسار بێژە

لە باغی گیانی خۆت چەند چەپک بهێنە
حیکایە و نەقڵی ئەو گوڵزار بێژە

لە حوسنی، باس و خواست زۆر پێیە
مەلوولیی تووڕ بدە ئەوجار بێژە

لە یادی دۆست شیرینتر چ خۆشە
دە دەم ببزوو مەبە بێکار، بێژە

لە یادی عالەمی غەددار مەبێژە
لە لوتفی عالەمی ئەسرار بێژە

لە لافی فیتنەیی تاتار کەم کە
لە ناوکی ئاسکی تاتار بێژە

له ئەشقی حوسنی شەمسەددینی تەورێز

له نێوان ئاشقان ئاسار بێژه

٩١

دەرپەڕیون شێتەکان لەو سلسلە

چونکە هەستا بۆنی گیان لەو سلسلە

نەعرەتەی ئاشقان بەرەو ئاسمان دەچێ

ئەلئەمان و ئەلئەمان لەو سلسلە

گیانی موشتاقان چ ناگونجێ ئیدی

پڕ زەمین و ئاسمان لەو سلسلە

پێشکەشی لەیلی دەکەم من هەردەمێک

گیانی مەجنوون ئەرمەغان لەو سلسلە

ئەڵقەی ئەشقت دە گوێچکەی ئێمە دا

دەرمەکە تۆ هۆشمان لەو سلسلە

فیتنەیەکت ئایساند لەو سلسلە

هەر بە تۆش دەکرێ مران لەو سلسلە

سەد برینی پێی گیان هی بەندی تۆن

گەرچی گیان بوە بێ نیشان لەو سلسلە

شەمسی تەورێزیی مرادم زولفی تۆن

هەرچی کردم من بەیان لەو سلسلە

**٩٢**

تەبیبی دەردی بێ دەرمان کێهایە؟

ڕەفیقی بازی بێ پایان کێهایە؟

ئەگەر ئەقڵە ئەدی شێتایەتی چیە؟

ئەگەر گیانە ئەدی جانان کێهایە؟

چرایی هەڵکراوی ڕوونی عالەم

کە نەک کوفرە و نە وەک ئیمان کێهایە؟

پڕی گەوهەر کراوە بەحری جاوید

دە ناخ دا گەوهەری ئینسان کێهایە؟

غولامانە و شڕە ئەشیا قەبایان

لە نێوان بەندەکان سوڵتان کێهایە؟

بەشێکی چووکی دونیاش بێ مەرەز نیە

تەبیبی ئەشقمان دوککان کێهایە؟

ئەقڵ عاجز لە فکری خاو و عاجز

کە سەرکەش کێ و سەرگەردان کێهایە؟

چما ئەو گفت و لفتەت کردوە قیبلە

بزانە دەرسی خامۆشان کێهایە

## ٩٣

ئاشق بووی ئەتۆ ئەی دڵ؟ سەودات مەبارەک بێ
لە جێ و مەکان دەرچووی؟ جێگات مەبارەک بێ

لە هەردوو جەهان دەرچە، تەنیا بژی تەنیا بە
تا موڵک و مەلەک بێژێ، تەنیات مەبارەک بێ

کفری تۆ هەموو دین بوو، تاڵییت هەموو شیرین بوو
هەڵوا بووە گشت هەڵوا، هەڵوات مەبارەک بێ

لەو خانەگەهی سینە غەوغای فەقیرانە
ئەی سینەی بێ کینە، غەوغات مەبارەک بێ

ئەم دیدەیی دڵدیدە ئەسرین بوو کە بوو دەریا
دەریاش دەبێژێ پێت، دەریات مەبارەک بێ

ئەی ئاشقی پەنهانیی، ئەو یارە قەرینت بێ
ئەی تالبی بەرزایی، باڵات مەبارەک بێ

خامۆش و مەکە باسی، سەودایەکی باشت کرد

کالای عەجەبت دەس کەوت، کالات مەبارەک بێ

شەمسولهەقی تەورێزیی سوڵتانی جەهانی تۆ

سەودایەکی سەیرت کرد، سەودات مەبارەک بێ

## ٩٤

وه کۆڵانی دڵم کەوتم زەمانێ

بپرسم من لە حاڵی دڵ نیشانێ

دەبێ چۆن و چلۆن بێ ئەو دڵەی من

کە دیتم لێی پەرێشانە جەهانێ

لە دەستی دڵ هەموو هاواریان بوو

حەدیسی وا کە لێی کەوتمە گومانێ

لە ئەقڵی خۆم بەرەو دڵ کەوتمە ڕێگا

کەچی نەمدیت بەتاڵ بێ لێی مەکانێ

لە نێوان عارف و مەعرووف دا دڵ

دەبێتە حاڵی هەروەک تەرجومانێ

خوداوەندانی دڵ ئاگان کە دڵ چیە

لە کوێ دەزانێ قەدری هەر نەزانێ

له دەرگاهی خودا دەبینی و بەس
وەگیرت ناکەوێ دڵ لای فڵانێ

نیە لای کەس جگە جەبباری عالەم
شەهیدی هەر نیشان و بێ نیشانێ

## ٩٥

خۆزگە ئەو ڕۆژە  لە بەر تۆ وەکوو سوڵتان دەمرم
لە کنت کانی شەکەر من شەکەرئەفشان دەمرم

سەدهەزاران گوڵی سەد پەڕ لە گڵم دێنە دەرێ
گەر لە بەر سێبەری وا سەروی گوڵستان دەمرم

شەربەتی مەرگ ئەگەر تێیکەیە نێو قەدەحم
ماچ دەدەم من لە قەدەح، مەست و خەرامان دەمرم

وەک خەزەڵ گەر خەبەری مەرگ بکا زەرد و کزم
وەک بەهاری دەمی خەندانی  تۆ خەندان دەمرم

زۆر کەڕەت مردم و دیسان بە دەمت زیندوو و گەش
خۆشە بمرم لە تۆ سەد جار و چ هاسان دەمرم

من پەراکەندە و خاک بووم، وەها جەمع کرام
هیچ لە جەمعت نیە شایان کە پەرێشان دەمرم

چ دەڵێی؟ کوانێ مەرگ دەستی دەگاتە ئاشق

چۆن  لە کانی و لە سەرچاوەیی حەیوان دەمرم

شەمسی تەورێز کەسانێک کە نەبن زیندوو بە تۆ

لای تۆ زیندوویی زیندووم، کە لە لای وان دەمرم

## ٩٦

چما داماوی لەو سووچە، چما تۆش ناگەڕێی یەکدەم
مەگەر تۆ فکری مەنحووسی، کە ناخوازی جگە لە خەم

کە هات مووسای عەمرانیی، چما تۆ ئالی فیرعەونی
کە هات مووسای خۆشڕاوێژ چما تۆ نابی لێی هاودەم

کە تۆ بەستت دەگەڵ هەق عەهد لە سستی بوو شکاندت عەهد
وەکوو قەول و قسەی پیاوان چما تۆش نابی زۆر مەحکەم

لە ژێر خاک هەروەکوو مشکان ڕەهەند دەبڕی بەرەو متبەق
چما تۆش هەروەکوو سوڵتان نەنێی هەنگاو لە سەر تارەم

چما وەک ئاڵقەی دەرگا دەقولبابی تەق و دەنگی
لە کۆڕی ئاڵقەی مەردان دەمێکی بۆ نەبی مەحرەم

چلۆن بیکاتەوە دەرگا کە دوژمن پێیەتی مفتاح
چلۆن باش بێتەوە بێمار کە پێینەدرابێ هیچ مەڵهەم

سەر ئەودەم سەر دەبێ گیانە کە خاکی ڕێگەکەی ئەو بێ

لە ئەشقی رایەتی ئەی سەر چما تۆ نابی بۆی پەرچەم

چما وەک هەوری بێ باران بەری مانگ دادەپۆشی تۆ

چما هەروەک مەهی تابان خولێک نادەی لە دەور عالەم

قەڵەم لەو جێیە دێتە دەست کە کەم بێ یەک دوو پیت و حەرف

چما بۆ ئەشقی تەسحیحی ئەتۆش نابی بە حەرفێک کەم

گوڵستان و گوڵ و ڕەیحان بە دەستی تۆ نەبێ ناڕوێن

دوو کانیاوت هەیە ئەی ڕوخ چما نابی پڕی شێ و نەم

کە تەووافانی نێو گەردوون گەڕان تێگڕا لە دەور ئادەم

مەگەر ئیبلیسی مەلعوونی کە ناخوازی گەڕی ئادەم

ئەگەر بۆ خەلوە ناچی تۆ چما نابی ئیدی خامۆش

ئەگەر نی ماڵی کەعبە تۆ، لەبەرچی نابی تۆ زەمزەم

**٩٧**

باکم لە کێ هەبێ من؟ خاسە کە یار دەگەڵ من

لە دەرزیی بۆ  بلەرزم؟ کە زولفەقار دەگەڵ من

کوا دەم ویشک دەمێنم؟ کە جۆگە جۆیای من

کەی غەم دەخوا دڵی من؟ کە غەمگوسار دەگەڵ من

تاڵیی چما بچێژم؛ نوقمم لە قەند و هەڵوا

چلە چما دەگا پێم؟ ئەو نەوبەهار دەگەڵ من

لە تا چما بخرۆشم؟ عیسا تەبیبی هۆشم

لە سەگ ناچێ هەترەشم، میری شکار دەگەڵ من

چۆن نەچمە بەزم و شادیی؟ ساقی دەسم دەکێشێ

چلۆن نەگرم شارەکان؟ ئەو شاریار دەگەڵ من

لە نێو کووپەی پادشا، مەی بۆ منە لە جۆشا

لێرە چ ئیش دەکا ئێش، ڕەنجی خومار دەگەڵ من؟

دەگەڵ چەرخ بە شەڕ بێم گەر بشکێم و بفەوتێم

عوزرم چ پێویست دەکا؟ ئەو خۆش عوزار دەگەڵ من

من نوقمی ملْک و نێعمەت، سەرمەستی لوتف و ڕەحمەت

کەوتوومە باوەشی بەخت، ئەو خۆش کەنار دەگەڵ من

ئەی ناتقە مەگوڕڕێ، تێر بووم لە گفت و ڕاوێژ

بێدەنگ بە هیچ مەبێژە، باس و گوفتار دەگەڵ من

## ٩٨

ئێمە هی باڵاین و بۆ باڵا دەچین

ئێمە هی دەریاین و بۆ دەریا دەچێن

ئێمە هی ئەولا و ئەم لایانە نین

ئێمە هی بێجاین و بۆ بێجا دەچین

کەشتی نووحین لە نێو تۆفانی ڕووح

نابەچارین بێ دەس و  بێ پا دەچێن

وەک شەپۆل سەرمان لە خۆ کێشا دەرێ

هەمدیسان بۆ ناخی ناپەیدا دەچین

ڕێگەیی هەق وەک کونی دەرزی تەنگ

لوول وەکوو هەودایەکی یەک لا دەچین

ئەختەری مە ناگەڕێ دەوری قەمەر

بۆ سەر و بۆ تەشق و بۆ باڵا دەچین

دەرکەوە لەو خەرمەنە ئەی کوێرەمشک

گەر نە کوێری سەیر بکە بینا دەچین

قالبی وەک کێومان گەر نەگرێ رێ

ئێمە بۆ قاف و بەرەو عەنقا دەچین

## ٩٩

وەرە ئەمڕۆ لە دەوری یار بچەرخین
بە سەرگەردیی وەکوو پەرگار بچەرخین

وەرە ئەمڕۆ لە دەوری خۆ نەسووڕێین
لە دەوری خانەیی خەممار بچەرخین

مەڵێ پێمان ئەمەین دێوانە و شێت
لە دەوری ئاگری گڕدار بچەرخین

وەها سووک بین وەکوو بایی بەهاریی
بە میوانی لە نێو گوڵزار بچەرخین

لەبەرچی هەروەکوو گوێ پڕ لە با بین
وەکوو مشکێک لە سووچ ئەنبار بچەرخین

لە شەکری ئاخنی عەتتار سندووق
لە دەور سندووقەکەی عەتتار بچەرخین

بڵا وەک کل لە خزمەت دیدە دا بین

وەکوو دیدە لە سەر دیدار بچەرخین

١٠٠

خۆزگە ئەو ساتە کە دانیشتووین لە هەیوان من و تۆ

بە دوو نەقش و بە دوو ڕوخسار و بە یەک گیان من و تۆ

ئەختەرانی فەلەکیی دێنە نەزارەی ئێمە

مانگی خۆمان دەنوێنین بە گشت وان من و تۆ

من و تۆ بێ " من " و"  تۆ " جەمع دەبین زەوق دەبەین

خۆش و ڕزگار لە خورافاتی پەرێشان من و تۆ

تووتیانی فەلەکیی گشتی شەکەرخۆر دەبن

لە مەقامێک بزەمان دێتێ و خەندان من و تۆ

ئەوە سەیرە من و تۆ ئێستێ لە کونجێک لێرەین

هەر  هەنووکەش لە ئێراقین و خوراسان من و تۆ

هەین بە نەقشێکی لە سەر خاک و بە نەقشی دیمان

لە بەهەشتی ئەبەدیین و شەکەرستان من و تۆ

لە کفر و ئیسلام بەدەر هەیە سارایەک
لەم نێوە هەمە ئەمن سەودایەک
عارف کە بگاتە ئەم پلە سەر دانێ
نە کفر و نە ئیسلامە، نە جێگە و جایەک

ئازادەیەکم دیت لە سەر ڕووی زەمین
نە کفر و نە ئیسلام و نە دونیا و نەدین
نە هەق نە هەقیقەت نە شەریعەت نە یەقین
کێ زاتی هەیە بڵی کە ئێمەین کە هەوین

ڕێگەی تەڵەبی ئاقڵ و دێوانە یەکن
بۆ ئەشق چ ناسیاو و چ بێگانە یەکن
ئەوکەس کە شەرابی وەسڵی یاریان دایە
لای مەزهەبی ئەو کەعبە و بوتخانە یەکن

جار شاراوە و جارجار پەیداین
جار موئمن و جار جوولەکە و جار تەرساین
تا ئەو دڵەمان قالبی گشت دڵ بگرێ
هەر ڕۆژە بە چەشنێک و بە جۆرێک شەیداین

من مەستم و مەستییم لە مەی حەمرا نیە
ئەم بادە جگە دە جامی سەودا دا نیە
هاتووی کە لە بادە تێکەی بۆ من
من ئەوکەسەیەم کە بادەکەم پەیدا نیە

گەر سەبر بکەم کراسی گیان گڕ دەگرێ
گیانی من و گیانی گشتمان گڕ دەگرێ
گەر هەرا بکەم زار و زمان گڕ دەگرێ
ئاورینگی دەڕوا هەر دوو جەهان گڕ دەگرێ

گەرما نە تەنێ تین و گڕ و سووتانە
گەرما ئەوەیە سەرم بدەی ئەم ئانە
گەر وەعدە بدەی نەیەی ئەوە سەرمایە
سەرما نە فەقەت بەفر و چلە و زستانە

بێ دەف مەیە لای ئێمە خەریکی سوورین
بکوتە لە دەهۆڵ، ڕابە کە وەک مەنسوورین
مەستین و نە مەستی بادەیی هەنگوورین
هەرچی کە خەیاڵی بۆ دەبەی لێی دوورین

ئەو ساتە کە غەم دامدەگرێ من شادم
ئەودەم کە خەراب دەبم ئەمن ئابادم
ئەوساتە کە بێدەنگ و کپم چەشنی زەوی
وەک بەرق و برووسک دەگاتە تەشق فەریادم

ئەی گیان و جەهان! گیان و جەهانم ون کرد
ئەی مانگ! زەمین و ئاسمانم ون کرد
مەی مەدە بە دەست لە سەر دەمی منی نێ
هێند مەستم کە ڕێی زار و زمانم ون کرد

گەر بادە وەشێرین ئەی بۆ بۆ چ بکەین
بۆ حاڵی خومار و دڵی بە سۆ چ بکەین
گەر ئەشق ویشک بکەین بە لێوی ویشکمان
ئەی بۆ چاوەیی چاوی وەک جۆ چ بکەین

دویَ بولبولێکی لەتیفی خۆشگۆ
بەستەی دەچڕی لە لێو و دەم جۆ
دەکریَ کە لە زێڕ و لەعل و زومroوود
ساز کەی گوڵی گەش بەڵام بەبیَ بۆ

سەبرت کە هەبیَ، پەردەی سەبرت دەدڕم
سەر دامەنیَ، خەو لە چاوت دەزڕم
گەر کێو و کەژی، بە ئاگرم دەتپێژم
گەر بەحری نمی، تەڕایی ئاوت دەبڕم

کە دیدە ڕۆیشت توونیای تۆ چ سوود
کە دڵ بوو بە خوێن وەفای تۆ چ سوود
کە گیان و جگەر سووتان نەمان لە سوێت
قسەی گیانبەخش و تەمای تۆ چ سوود

لە پێناو ئەشقت تا چەند قسە و پەند
تاڵاوم چەشتوە چ سوود شەکر و قەند
دەڵێن کە پێبەند بدەن لە جووت پێم
دێوانە دڵە چ سوود پەت و بەند

گەر هەموو دەریا پڕ بێ لە نەهەنگ
گەر گشتی سەحرا پڕ بێ لە پڵەنگ
گەر نێعمەت و ماڵ پڕ کا چاوی تەنگ
ئاشقان دەگرن جەماڵی جوانڕەنگ

لەو شوێنە عینایەتە چ ئاشتی بێ چ جەنگ
گەر کاری تۆ چاکە بێ چ تەسبێح و چ چەنگ
ئەوکەس کە قەبووڵ کرا چ ڕۆمیی بێ چ زەنگ
تەسلیم و ڕەزایە ها دەنا کەڵلە و سەنگ

گیانێکم هەیە لەجووج و سەرمەست و فزوول
یارێکم هەیە لەتیف و بێسەبر و مەلوول
لە منەوە بۆ یاری من، رەسوولە خودا
لە یارەوە بۆ لای من، خودایە رەسوول

دە خامۆشیی دا بۆ دەبی کول و مەلوول
خوو بگرە بە خامۆشیی کە ئوسوولە ئوسوول
خۆی کوا خامۆشیی؟ ئەوەی کە خامۆشە
سەد بانگ و هەرا و پەیامە و رەسوول

ئەشقێک بە کەماڵ و دڵڕفێنی بە جەماڵ
دڵ مەیلی قسە و زمان لە گوفتار بووە لاڵ
لەم سەیرە مەحاڵتر نەبووە هەرگیز حاڵ
تینووم و لە بەردەم دەڕژێ ئاوی زوڵاڵ

جار بۆ دیدار پەرێشان و نەخۆشین
جار لە جەوری هیجر، کاس و بێهۆشین
گەر لە من و لە تۆ، ئەم من و تۆ پاکەوە بێ
ئەوسا من و تۆ بی من و تۆ کەیفخۆشین

گەر دەریای تۆ، ماسی دەریای تۆم
گەر سەحرای تۆ، ئاسکی سەحرای تۆم
بمژەنە خۆش، منم بەندەی بینی تۆ
زورنای تۆ زورنای تۆ زۆڕنای تۆم

کوتم سەگی نەفس مەگەر پیر بکەم
قەڵادەی تۆبەی لە زنجیر بکەم
مردار ببینێ دەپسێنێ زنجیر
دەگەڵ ئەم سەگە چ تەدبیر بکەم

ئەی زەخمەژەنی ژێی ڕوبابی دڵی من
گوێ بگرە لەناڵە و جوابی دڵی من
هەر وێرانەیەک و خەزێنەیەک و گەنجێک
سندووقی ئەشق دەفنی خەرابی دڵی من

ئەی ناڵەیی ئەشقی تۆ روبابی دڵی من
هەر ئاهـ و نزایە هەموو جوابی دڵی من
ئەو دەوڵەتی مەعموورە کە پرسیاری دەکەی
دەیدۆزییەوە ئەمما لە خەرابی دڵی من

سەرمەست لە تۆم نەک لە مەی و نەک ئەفیون
مەجنوونم و مەخوازە ئەدەب لای مەجنوون
لە جۆش و کوڵم بێتە هەژین سەد جەیحوون
لەم چەرخ و خولەم گێژ و بڵاو بێ گەردوون

حەیفە کە لە لای کەڕ بژەنی تەنبووری
یا یۆسفی هاوماڵ بکەی لای کوێری
یا قەند بنێی لە سەر دەمی ڕەنجووری
یا جووت ببێ موخەننەسێک و حۆری

هەرکەس کەسەکێکی هەس و هەرکەس یارێ
هەرکەس هونەرێکی هەس و هەرکەس کارێ
ئێمەین و خەیاڵی یار و ئەم گۆشەیی دڵ
وەک ئەحمەد و بووبەکر، لە سووچی غارێ

لۆتکە کە دەڕوا، تیژ و ڕەوان تێدەپەڕێ
پێیوایە نە ئەو، قامیشەڵان تێدەپەڕێ
ئێمەش کە دەڕۆین بە سەر جەهان دا هەروایین
لامان کە نە ئێمەین و جەهان تێدەپەڕێ

# فەرهەنگۆک

ئازەر: ئاگر

ئاو و گڵ: جەهانی ماددیی

بورنا: لاو، جەوان، گەنج

پیرۆزە: مەلی بەختەوەریی، هوما

جانان، جانانە: یار، کراوی، مەعشووق، مەحبووب

جەبین: نێوچاوان، توێڵ

جەوهەریی: گەوهەریی، گەوهەرفرۆش

حبل المتین: گوریسی قایم هەروەها کینایەشە لە شەریعەت و قورئان

حەسین: جێگە و قەڵای قایم و پتەو

حەمرا: سوور، ئاڵ

خەراب: ١- وێران، ڕوخاو. ٢- زۆر مەست، سیامەست

خەرابات: ١- مەیکەدە، مەیخانە. ٢- شوێن و پلەی گرینگایەتی نەدان بە داب و نەریتی باو.

خەزرا: سەوز، کەسک

خەسم: دوژمن، نەیار

خەممار: ١- بادەفرۆش، خومرفرۆش. ٢- پیری ئەسڵ و کامیل

زوهرە: ئەستێرەیەک کە بە موتریبی فەلەک دەناسرێ، ناهید.

دوڕی مەکنوون: مرواری گرانبایی جوان و باش

دەستان: نازناوی زال باوکی ڕۆستەم

دەفین: شاراوە لە ژێر خاک، دەفنکراو

رایەگان: بەلاش، خۆرایی، مفت

زینهار: ئەمان (بێ زینهار: بێ ئەمان)

ژەنگاریی: لە ڕەنگی ژەنگ و ژەنگار، سەوز، کەسک

سارەبان: وشترەوان، قەتارچی

سەحیفە: کتێب، نامە

سەدرە: سینگ، سینە

سەرمەدیی: ئەبەدیی، هەمیشەیی

سەقەر: دۆزەخ، جەهەننەم

سەگسار: وەک سەگ، بە تەماح، دونیاپەرست

عوزرا: مەعشووقەی وامیق

عەوان: پاسەوان

فەردا: سبەی، بەیانی

قاف: کێوی قاف لە ڕوانگەی عارفانەوە بە مانای وڵاتی دڵ و خودی دڵە و عەنقا بە ڕووحەکەی دادەندرێ.

قەران: موقارنە، زاراوەیەکی ئەستێرەناسییە بە مانای کۆ بوونەوە و موقارنەی دوو ئەستێرە لە بورجێک.

کەمووتەرخانە: شوێنی ڕاگرتنی کۆتر، کۆترخان

کەیوان: ئەستێرەیەکە، زوحەل

گەست: ناحەز، کرێت

گەهوارە: لانکە، بێشکە

گەوهەریی: گەوهەرناس، گەوهەرفرۆش

لالا: ١- لەلە، خزمەتکار ٢- کەسێکی زانا کە پێگەیاندن و پەروەردە کردنی منداڵی گەورە ماڵانی بە ئەستۆوەیە.

لۆک: وشتری نێر

لەوامە: نەفسی لەووامە، نەفسی لۆمەکەر

ماڵی کەوان: داری چەمیوی کەوان، ئەو شوێنەی کەوان کە تیری تێدەنێن

موخەننەس: پیاوی ژنانیلە، پیاوێک کە پێینەکرێ.

مەخدووم: خاوەن خزمەتکار، ئەرباب

مەکنوون: شاراوە، شاردراوە

نەقشبەند: نەققاش، نەقشکێش

واميق: ئاشقی عوزرا

ئەرکان: چوار عونسوری ئاو و ئاگر و خاک و با

ئەسما: ناوەکان

ئەکنوون: ئێستا، هەنووکە

ئەلتاف: لوتفەکان

ئەممارە: نەفسی ئەممارە، نەفسی ئەمرکەر

ئيما: ئیشارە، ئاماژە